# سەلەفییەکان

سەرهەڵدانیان..تێڕوانینیان..
هەڵویستیان لەگرۆ ئیسلامییەکان

نوسینی:

یاسین تەها محەمەد

# ڕونکردنەوەیەک

ئەم لێکۆڵینەوەیە، لەساڵی ٢٠٠٣ دا، وەک بەشێک لەپێداویستییەکانی بەدەستهێنانی بڕوانامەی بەکالۆریۆس، لەژێر ناونیشـــانی «بیری سیاســـی وەهابیزم» بۆ بەشی مێـــژوی کۆلێژی زانســـتە مرۆڤایەتییەکانی زانکۆی ســـلێمانی ئامادەکراوەو پلەی باڵای وەرگرتوە. بەڵام دوای پێنج ســـاڵ لەئامادەکردنیو لەکۆتایی ٢٠٠٨ دا، بۆم رەخســـا سەفەرێکی یەک مانگیی بۆ عەرەبستانی سعودیە بکەمو لەوێ لەنزیکەوە هەڵوێستەی مەیدانییم لەسەر گەلێک لەبڕگەو باسەکانی ئەم بابەتەکرد، هەر لەبەر ئەمەش بەپێویســـتمزانی ســـەرلەنوێ پێیدا بچمەوەو هەندێک زانیاریو تێبینیتری بخەمەسەرو چاپی بکەم.

# پێشکەشە ..

بە گیانو یادەوەریی ئەو کەسەی بەردەوام بەسەرهاتی تاڵی تیرۆرکردنی لەناخەوە ئازارم دەدات.. رەحمەتیی مامم: مەلا یوسفی گلێجاڵ.

ناوی کتێب: سەلەفییەکان
نوسینی: یاسین تەها محەمەد
بابەت: لێکۆڵینەوە
دیزاینی بەرگو کتێب: سەردەشت عەزیز
تیراژ: ٥٠٠ دانە
نرخ: ٢٠٠٠ دینار
چاپ: چاپخانەی کارۆ
چاپی یەکەم ـ ساڵی ٢٠٠٩
ژمارەی سپاردن: ١٤٧٨ی وەزارەتی رۆشنبیری ساڵی ٢٠٠٩ی پێدراوە

# ناوەڕۆك لاپەڕە

# دەسپێک

سەلەفییەتگەرایی، بزاڤو بیرکردنەوەیەکی ئیسلامیی بەرچاوی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستو دواتریش سەراپای جیهانی ئیسلامییە. گرنگیی ئەم تێڕوانینە ئاینییە لەوەدایە، جگە لەنێوەڕۆکە فیکرییەکەی، ئاینزای فەرمیو کارپێکراوی عەرەبستانی سعودیەی لانکەی هەرە پیرۆزترین مەڵبەندو شوێنەوارە ئیسلامییەکانە.

ریشەی بانگەوازی سەلەفی، دەگەڕێتەوە بۆ کەلتورو هەڵوێستەکانی ئیمام ئەحمەدی کــوڕی حەنبەل، کە لەســەدەکانی نێوەڕاســتدا بــە داکۆکیکردنی سەرســەختانە، لەپابەندبون بەدەقو رەتکردنەوەی داهێنانکاری ئاینیی، داستانێکی گەورەی لەمێژوی ئیسلامو خەلافەتی عەبباسیدا لەبەغدا تۆمارکرد. لەدوای ئەویش ئیبن تەیمیە لەوڵاتی شــام، ســەدەی حەوتەمی کۆچی، رایەڵە ســەرەکییەکانی گەڵاڵەکردوە. لەسەدەی هەژدەیەمیشدا، لەسەردەستی محەمەدی کوڕی عەبدولوەهابو نەوەو شوێنکەوتەکانی، لەبیابانەکانی نیمچە دورگەی عەرەب، دیســان نۆژەنکراوەتەوە. ئەم جارەیان جیاواز لەدوو جارەکەیتر، قەدەری وەهابوە ببێتە بەشــێک لەدەســەڵاتو ئەمەش بۆتە هۆی ناساندنو ناوبانگپێدانی.

ئەگەرچی بیری سەلەفی، لەنیوە دورگەی عەرەب، سەرەتا وەک بانگەوازێکی چاکسازیی ئاینی سەریهەڵدا، بەڵام لەبەر گەلێک هەلومەرج کە دواتر دێینە سەریان، خێرا لەگەڵ سیاســەتو حوکمڕانیــدا ئاوێتەبوەو دواتریش بۆتە ســەرچاوەی جیهانبینیی گەلێک گروپو بیرکردنەوەی ســەلەفیتری جیهانی ئیسلام.. ســەرنماو رێبەرەکانی ئەم بیرە ئاینییە کەنارگیرە، دوای ئەوەی پێگەی ئاینیو سیاســی خۆیان لەسعودیەی روگەی سەرجەم موســوڵمانانداندا چەسپاند، بەســود وەرگرتن لەپێگەی ئاینیو ئابوریی ئەم دەوڵەتەو بەســود وەرگرتن لەگردبونە ملیۆنییەکانی ســاڵانەی وەرزی حەجکردنەوە، خێرا رویانکردە وڵاتانیتری جیهانی ئیسلامو لەرێگای کاری خێرخوازیی.. بانگەوازکردن بۆ ئیســلام.. کردنەوەی کەنــاڵو ماڵپەڕی ئەلەکترۆنــی.. دامەزراندنی خوێندنگای ئاینیو.......هتد.

جیهانی ئیســلامیان تەندوەو لەئێستادا هەر لەئەندەنوســیاوە تا باکوری ئەفەریقا، تۆڕێک پەیوەندیو هەوادارییان هەیە.

بیری سەلەفیی، لەجیهانی ئیسلامیدا، زیاتر وەک رکابەرو کێبەرکێکاری بیری شیعەو

سۆفیگەری دەخرێتەڕو. ئەم بیرە ئیسلامییە، هێندە لای موسوڵمانە پابەندو گەنجەکان، کاریگەرو سەنگینە، زۆرێک لەلایەنو گروپە چەکدارە ئیسلامییەکان، شانازی بەفیکرو بەبوێریو جەربەزەیی زاناو سەردەستە پێشینەکانییەوە دەکەنو لای خەڵک خۆیان بەشاگردو خوێندکاری ئەم کەلتورە دەناسێنن. ئەمەش وایکردوە، بەمدواییانە ناوی وەهابییو سەلەفیی، لای زۆرێک لەناوەندەکان، لەریزی ئەو بیرو گروپانەدابێت کە خۆرئاوا، بە «تیرۆریست»و «توندڕەو» ناودێریان دەکەن.

لە ١١ ئەیلولی ٢٠٠١، کۆمەڵێک لاوی دایکو باب سعودیی، پەروەردەی خوێندنگاکانی ئەم وڵاتە، لەگەڵ کۆمەڵێک گەنجیتری عەرەبدا، بەپلانی ئەلقاعیدە، ئەمەریکاو دنیایان هەژاندو بەتەقاندنەوەی هەردو تاوەری تەلاری بازرگانیی جیهانیو بارەگای پنتاگۆن، تەواوی جیهانیان خستە سەر دوڕێیانی «تیرۆر»و «دژە تیرۆر». بەهۆی رەگەزی ئەم گەنجانەشەوە، ناوی وەهابیو کارنامەی دامەزراوە ئایینییەکانی سعودیەو ئەگەری تێوەگلانییان لەم روداوە مەزنە، بوە باسو بابەتی میدیا زەبەلاحو سەنتەرو دەزگا لیکۆڵەرە دەنگ بیسراوەکان. بەڵام سیاسەتوانە سعودییەکانو زانا ئاینییەکانی ئەم وڵاتە، لەسەرو هەموشیانەوە لێزانیو کۆششە لێبڕاوەکانی شا عەبدوڵڵا عەبدولعەزیز، کە ئەودەم بەفەرمی وەلی عەهدو بەفیعلی پادشای سعودیەبو، پێکرا، توانیان هێڵە سەرەکییەکانی بیرو بانگەوازی سەلەفی لەو قەیرانو تەنگەژە ئاڵۆزە بپەڕێننەوەو بەشێکی زۆری دامەزراوەو پرۆگرامە سەلەفییەکانی خوێندن لەسعودیە، لەرقو توڕەیی ئەمەریکا قوتاربکەن، کە لەدوای کارەساتەکە، وەک شێری بریندار کەوتە پەلاماردانی هەمو ئەو شتانەی، بچوکترین گومانی لێیان هەبو[١].

لەم قۆناغەدا ـ واتە دوای ساڵی ٢٠٠١ ـ عەقڵی سیاسیو شەرعیی سعودی شانبەشانی کۆششکردن بۆ رزگارکردنی سەلەفیەتی بیری ئاینیی وڵات، بناغەی قۆناغێکی نوێیان

١. گۆڤاری news week ی ئەمەریکی لەژمارەی ٣١/ ئازاری ٢٠٠٩ دا، ئاماژە بەوەدەکات، کاتێک کارەساتی ١١ی سێبتەمبەر رویداوەو دەرکەوتوە ١٥ لەکۆی ١٩ لەئەنجامدەرە خۆکوژەکانی کارەساتەکە سعودین، شا عەبدوڵڵا، هەر لەنوێژی بەیانییەوە تانزیکی نیوەڕۆ نوێژیکردوەو دەرگای کۆشکەکەی لەسەر خۆی داخستوە. ئەوشایەتحاڵەی ناوبراوی لەسەر ئەم حاڵەتە دیوە لەلیدوانەکەیدا بۆ نیوزویک دەڵێت «ئەو رۆژە تەنها شا عەبدوڵڵا ئەوەندە نوێژیکرد، هەرگیز نەمدیوە ناوبراو ئەوەندە نوێژ بکات». لەدوای نوێژەکانیش بەبارێکی دەرونی ناجێگیرەوە رویکردە میوانەکانیو وتی «من دڵنیام گەلی چاکی ئێمە ئەم کارانە ناکەن». لەدوای ئەم روداوەشەوە شای سعودیە ئیتر بەئەندامانی ئەلقاعیدەی دەوت «گرۆی سەرلێشێواوان»و «لەدین دەرچوەکان»، وەک ئەوەی هەرگیز رەعیەتی ئەو نەبن.

لەکاروانی ئەم بیرەدا دانا، کە ئەویش زەقکردنەوەی «لادانی قاعیدەو جیهادییەکانیتری هاوشێوەیەتی لەراستە رێگای ئیسلام». لەماوەی ئەم هەشت ساڵەدا، سەلەفییەکانی ســعودیە، بەگەلێک شــێوازو لەچەندین رێگاوە، رەنجی فەرهادیان کێشاوە بۆئەوەی بیسەلمێنن ئیسلامو بیری سەلەفی، لەشیوێکدایەو ئەلقاعیدەو هاوبیرەکانیو دیاردەی تیرۆر، لەشیوێکی دورتر.

ئەم لێکۆڵینەوەیە کە ناونیشــانی «ســەلەفییەکان» ی هەڵگرتــوە، لەدو تەوەرەی سەرەکیو پەیوەندیدار بەیەکتر پێکهاتوە. تەوەرەی یەکەم، گوزەرێکی خێراو مێژوییە بەســەرەتاو چۆنییەتی سەرهەڵدانی بانگەوازی ســەلەفیی لەنیوە دورگەی عەرەبو دیدوتێڕوانینیــان لەســەر باسو بابەتــە بنەڕەتییە شــەرعییەکانی وەک: عەقیدە، بیدعە، جیهاد، دەســەڵات، تەکفیر،....هتد، دەخاتە بەرباسو شیتەڵکردن. هەرچی تەوەرەی دوومیشە، بریتییە لەســۆراغکردنی پێگەی بیری سەلەفیی لەجیهانی پانو بەرینی ئیسلامو هەوڵ دەدات لەجومگە سەرەکییەکانی بیری ئیسلامیدا، لەگەڵ دیدو تێڕوانینی سۆفیگەریو شــیعەگەرێتی کە دوو گرۆ ئیسلامییە گەورەکەی رۆژهەلاتن، بەراورد بکات.

هاندەرم لەهەڵبژاردنی ئەم بابەتەدا بۆ لێکۆڵینەوە، جگە لەحەزی شەخســیو هۆگریم بەو توێژینەوانەی دەربارەی دەســتەو بۆچونە ئیسلامییەکان دەکرێن، ئەو دەمەقاڵەو نیشــانەی پرسو تۆمەتبارکردنە زۆرانەن کە لەسەر سەلەفییەتو بانگەوازی وەهابی لەئارادان. پێشــنیازو هاندانی سەرپەرشتیاری بەڕێزیشم د. دلێر ئەحمەد، کە ئەودەم ســەرۆکی بەشی مێژوی کۆلێژی زانســتە مرۆڤایەتییەکان بو، زیاتر یەکلای کردمەوە بــۆ ئەم کارەو بڕیاری پێــدام. کاتێکیش کەوتمە کۆکردنەوەی ســەرچاوەو زانیاریی لەســەر ناوو ناوەڕۆکی بابەتەکە، خۆم لەبەرداشــی شەڕو دەمەقاڵەیەکی دورودرێژی بانگەوازی ســەلەفییو نەیارو ناحەزەکانیدا دۆزییەوە، منیش ئەوەندەی پێمکرابێت، هەوڵمداوە، خســتنەڕوی دەقو راســتییە هزرییو مێژوییــەکان بکەمە خەمی خۆمو حوکمدانو بڕیار لەســەردانیان بۆ خوێنەر بەجێبهێڵم. زۆربەی ئەو سەرچاوانەشــی بەکارمهێناون زیاتر کتێبنو بەپێی پێویســتیش پشتم بەگۆڤارو وێب سایت بەستوە..

بۆ دڵنیاییو متمانەی زیاتریش گەڕاومەتەوە بۆســەر ئــەو بەرهەمانەی کە لەلایەن گــەورە زانــاو بیرمەندەکانی وەک (محمد بن عبدالوهــاب)، (محمد صادق الصدر)، (عبدالرحمــن الوکیل)و بیرمەندانیتری ریزی یەکەمی بیرە ئاینییەکانەوە نوســراون. لەروی نوســینو داڕشتنیشــەوە بەپێی بەشــەکانو داخوازیی لێکۆڵینەوەکە شێوازم

گۆڕیوەو بەشێوەیەکی گشتی ڕێبازەکانی (گێڕانەوەی مێژویی، شیکارکردن، ستایش) م بەکارهێناوەو لێکۆڵینەوەکەم بەسەر سێ بەشو تەوەرەی سەرەکیدا دابەشکردوە:

**بەشـــی یەکـــەم:** چەمـــکو زاراوەی وەهابـــیو مێـــژوی وەهابییە ســـەلەفییەکان، روندەکاتەوە.

**بەشی دوەم:** گرنگترین بنەما هزرییەکانی بانگەوازی سەلەفیی لەخۆدەگرێت.

**بەشی سێیەم:** بەراورد لەنێوان بیری سەلەفیو شیعەو سۆفیگەریدا دەکات.

لەکۆتاییدا ماوە بڵێم، ئەم بەرهەمە هەوڵێکی سادەو بەراییەو بۆچونو هەڵهێنجانەکانی ناویشـــی دوابڕیارو کۆتا قسەی ئەم دۆسییە ئاڵۆســـکاوەنییە، کەمالو بێ هەڵەییش تەنها بۆ خوایەو دەخوازم ئەوەی دەیخوێنێتەوە چاوپۆشی لەکەموکوڕییەکانی بکات، هەرکەســـیش بۆچونێکی جیاوازتری لەوتراوەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە هەیە بەســـنگی فراوانو دور لەپەتاو دەردی کوشـــندەی دەمارگیریی وەریانبگرێتو لەســـەرنجەکانی خۆی ئاگادارم بکاتەوە.

# بەشی یەکەم

# مێژوی وەهابییەکانو هەلومەرجی سەرهەڵدانیان

## چەمکو شوناسی وەهابی

گەڵاڵەکردنی پێناسـێک بۆ بزوتنەوەی وەهابیی سەلەفی، کارێکی هەروا سادەو سانا نییەو ئاستەنگی زۆری لەپێشدایە. هۆکاری ئەم حاڵەتە، زیاتر لەو دەمەقاڵەو ناکۆکییەوە سـەرچاوە دەگرێت کەلەنێوان مێژونوس‌و بیرمەندە خۆرئاوایـی‌و خۆرهەڵاتییەکاندا هەیـە دەربارەی کارنامەو مێژوی ئەم بزوتنەوەیە. جگە لەمەش زۆرێک لەناسـاندنە بەردەسـتەکانی ئـەم بانگـەوازە، هەڵقـوڵاوی بەرژەوەندییە جۆراوجـۆرە، ئاینی‌و سیاسییەکانو کەمتر پەیوەستن بەمەرجو پێودانگە زانستی‌و بابەتییەکان.

هەندێـک لەنوسـەرو زانا ئاینییـەکان بزاڤی وەهابـی بەڕەوتێکی «گێرەشـێوێن‌و ئاژاوەچی» ناوزەد دەکەن[1]. کەچی هەندێکیتر بەسەرمەشق‌و سەرنمای بزاڤە چاکخوازە ئاینییەکانی رۆژهەڵاتی ئیسـلامیی، سەردەمی نوێ دەیدەنە قەڵەم[2]. بۆچونیتر هەیە، وەهابییـەکان، لەچێوەی بزاڤێکی نەتەوەیی عەرەبیدا قەتیس دەکات[3]، هەندێکیتریش زۆر پێچەوانە دەڕۆن‌و بە «پاشکۆیەتی‌و دەستکردی ئیستیعماری ئەوروپی‌و ئینگلیزی» تۆمەتباریدەکەن[4].

کێشەی ناساندنی ئەم بیرکردنەوە ئاینییە سەلەفیخوازە، تەنها لەناوەڕۆکدا نییە، بەڵکە خودی ناوەکەشـی «وەهابی»، هەڵگری قەیران‌و دەمەقاڵەی زمانەوانی‌و زانستییەو قسەو راوبۆچونی زۆری لەسەرە.

مێژونوس‌و شارەزا ئینسکلۆپیدییەکان، لەسەر ئەوە کۆکن، کە بنچینەو ریشەی زاراوەی وەهابـی، بۆ ناوی دامەزرێنـەرو بناغەدانەری بزوتنەوەکە: محەمـەد عەبدولوەهاب،

١. أحمد بن زيني الدحلان: فتنه الوهابيه، ل٣.

٢. د. عبدالوهاب الكيالي: الموسوعه السياسيه، ل٣٥٧.

٣. كارل بروكلمان: تاريخ الشعوب الاسلاميه، ل ٥٤٩.

٤. عبدالله محمد: هكذا رأيت الوهابيين، ل٧

دەگەڕێتەوە[1]. لەگەڵ ئەمەشدا نوسەرانو بیرمەندان، رەخنەیان لەسەر ئەم ناوزەدکردنە هەیـــەو پێیان وایە، هەڵەیەکی گـــەورەی زمانەوانیو زاراوەییـــە، چونکە ئەگەر بەم پێوەرەبێـــت، دەبوایە لەناونانی ئەم بزوتنەوە ئاینییـــەدا بەناوی دامەزرێنەرەکەیەوە بوترایە: محەمـــەدی، نەک وەهابی، عەبدولوەهابی باوکی محەمەد*، دورو نزیک هیچ پەیوەندییەکـــی بـــەو بزوتنەوەیەوە نەبوە[2]، بگرە، محەمـــەد، ماوەیەک دوای مردنی عەبدولوەهابی باوکیو لەســـاڵی ١٧٤٠ زاینیدا، بانگەوازو بۆچونە دانســـقە ئاینییەکەی خۆی ئاشـــکراو بڵاوکردۆتەوە[3]. لەمەش گرنگتر، هەندێک ســـەرچاوەی مێژوویی باس لەوەدەکـــەن، عەبدولوەهابـــی باوکی محەمـــەد عەبدولوەهاب، پشـــتیوانی بۆچونە ســـەلەفییەکانی کوڕەکەی نەکردوە[4]، ئەمەش زیاتر هەڵەیی ئەم ناونانەی رێبازەکە، بەناوی عەبدولوەهابەوە، ئاشـــکرادەکات، بەڵام ناوی وەهابی هێندە ناوێکی بەربڵاوو

١. د. عبدالمنعم الحنفی: موســـوعه الفرق والجماعات والمذاهب والحركات والاحزاب الاســـلاميه، ل٦٨١ ـ ٦٨٢.

* نـــاوی تـــەواوی (ابو عبدالله محمد بن عبدالوهاب بن ســـليمان)ەو لەهـــۆزی بەنی تەمیمی نەجدییە. لەســـاڵی ١٧٠٣ زاینیو لەســـەردەمی میرنشـــینایەتی عەبدوڵڵای کوڕی موعەممەردا، لەگوندی عویەینە ـ ٧٠ کم باکوری ریازی پایتەختی سعودیە ـ لەدایکبوە. عەبدولوەهابی باوکی قازیو شـــەرعزان بوەو بەمنداڵی بنەماکانی شەرعزانیو قورئانو فەرمودەناسی لەسەر رێچکەی حەنبەلـــی بەمحەمەدی کوڕی خوێنـــدوە. محەمەد عەبدولوەهاب، لەتافی لاویـــدا بۆ وەرگرتنی زانســـتە شەرعییەکان، سەردانی شارەکانی بەغداو بەسرەی عێراقو مەدینە، ئیحساو حورەیملای سعودیەیکردوە. هەر لەمنداڵییەوە وەک کەسێکی بیرتیژو لێهاتو ناسراوە.. سلەیمانی براگەورەی کە دانوی لەگەڵیدا ناکوڵێتو پێی قەڵەســـە، دەچێتە ژێرباری ئەوەی باوکیان هەر لەمنداڵییەوە بـــەزەکاو توانای لەبەرکردنـــی محەمەد، سەرســـامبوە. محەمەدی کـــوڕی عەبدولوەهاب، هەر لەمناڵییـــەوە خوی بە بەرهەمەکانی ئیبـــن تەیمییەی حەڕانیو ئیبن قەیمی جەوزییەوە، گرتوەو پێیـــان کاریگەربوە. دەگێڕنەوە کە محەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب، بەشـــێوەیەکی رۆژانە کۆڕی وەعزوو وتاردانـــی لەمزگەوتەکاندا دەگێڕاو خاوەن ١٤ بەرگ دانراوو بەرهەمی جیاجیایە لەبوارە جۆربەجۆرەکانی شەرعزانیدا. بۆ زیاتر بڕوانە:
أحمد بن حجر ال بوطامی: الشيخ محمد عبدالوهاب عقيدته الاصلاحيه ودعوته السلفيه ل١٥

٢. عامر عبدالله فالح: معجم ألفاظ العقيده، ل ٤١٢، هەروەها السيد محسن الامين: كشف الارتياب فی أتباع محمد بن عبدالوهاب ل١٢

٣. جعفر السبحانی: مع الوهابيين فی خططهم وعقائدهم، ل١٤.

٤. السيد محسن الامين: كشف الارتياب، ل١٤

ناســـراوە هیچ لێکۆڵەرێک ناتوانێت، فەرامۆشـــی بکات، هەرچەشـــنە هەوڵدانێکیش بۆ راســـتکردنەوەی ئەم هەڵەیـــەو بەکارهێنانی ناوی راســـتەقینەی وەهابییەکان کە «ســـەلەفی» یان «بانگەوازی یەکتاپەرســـتی» یە، بۆ ئەم رەوتە ئاینییە، خوێنەر بەهەڵەدا دەبات، بۆیە لەم لێکۆڵینەوەشـــدا بەناچـــاری زۆرجار ناوی وەهابی بۆ ئەم رەوتە سەلەفییە بەرچاودەکەوێت.

تائێســـتا بۆ مێژونوسان ســـاغ نەبۆتەوە، کێ یەکەمجار ناوی (وەهابی) لەبانگەوازی سەلەفیانەی محەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب، ناوە. بەڵام مەرجلیوسی رۆژهەڵاتناس، کە یەکێکە لەئامادەکارانی ئینســـکلۆپیدیای ئیســـلامیی ئاماژە بەوەدەکات، نەیارانی محەمەد عەبدولوەهاب، ئەم ناوەیان لەبزوتنەوەو بانگەوازە سەلەفییەکەی ناوبراو ناوە[1]. ئەوەی بۆچونی ئەم رۆژهەڵاتناســـە پشتڕاســـتدەکاتەوە، بێزاریی لایەنگرانی محەمەد عەبدولوەهابە، لەم زاراوەیە، بەجۆرێک لەلایەن گەورە رێبەرە سەلەفییەکانەوە، وەک تۆمەتو ناوزڕاندن ئەژماردەکرێت[2]. بەڵام بەکارهێنانی ئەم زاراوەیە هێندە بەناوبانگو بـــڵاوە، هەندێکجار ســـەلەفییەکانیش خۆیان، ناچارن دانی پێـــدا بنێن، ئەوەتا مەلا عیمران حیجازی، کە پیاوێکی ئاینی شـــیعەبوەو دواتر بۆتە ســـەلەفی، دەڵێت « ان کان تابع احمد متوهبا فانا المقر بانني وهابي»، واتە: ئەگەر شوێنکەوتنی ئەحمەد ـ مەبەست پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم ) ـ وەهابیبون بێت ئەوە من جاڕدەدەم، وەهابیم. هەندێکیتریان لەچەشـــنی شـــێخ محەمەد تەقی ئەلهیلالی کە زانایەکی ســـەلەفییە، هەوڵـــدەدات، مانایەکیتر بـــۆ ناوی وەهابی بدۆزێتەوەو دەڵێت «نســـبوا إلی الوهاب خیر عباده یا حبذا نســـبي إلی الوهاب» واتە: باشـــترین کەسیان داوەتە پاڵ وەهاب، چەند خۆشـــە بمدەنە پاڵ وەهاب. مەبەستی ئەوەیە محەمەد عەبدولوەهابیان داوەتە پاڵ وەهاب کە یەکێکە لەناوەکانی خوداو ئەمەش مایەی خۆشـــحاڵییە. بەمدواییانە، هەندێک دەقی شـــیعریی کەوتونەتە دەســـت لێکۆڵەرانو مێژونوسانو دەیسەلمێنن، زاراوەی وەهابـــی، ناونانـــی نەیـــارانو رکەبەرەکانی محەمـــەد عەبدولوەهابە لەدژی بزوتنەوەکەی. ئەم بەڵگەنامانە ئاماژەی ئەوەش بەدەســـتەوە دەدەن، ناوی وەهابی، لەدەمی سەرهەڵدانو چالاکیی بزوتنەوەکەشدا هەر هەبوەو ناونانێکی نوێ نییە[3].

١ـ أبو مسعود الندوی: محمد بن عبدالوهاب مصلح مظلوم ومفتری علیه، ل ٣١٧.

٢ـ د. عبدالله عبدالمحسن الترکی: مقدمه شرح العقیده الطحاویه، ل٣٩.

٣ـ سلیمان بن سحمان النجدی: الهدیه السنیه والتحفه الوهابیه النجدیه، ل١١٠.

هەندێــک لەشــارەزایانی ئەم بیــرە، ئاماژە بەوەدەکەن، نوســەرانو مێژونوســـان، بۆیە نــاوی (محمدی) یان بۆ بانگــەوازی محەمەد عەبدولوەهــاب، بەکارنەهێناوەو بزوتنەوەکەیــان داوەتە پاڵ عەبدولوەهابی باوکی، بۆ ئــەوەی بزوتنەوەکەی ناوبراو لەگەڵ شــوێنکەوتوانی یەکەمی ڕێبازی محەمەدی پێغەمبەری ئیسلام(صلی الله علیه وسلم) دا جیابکەنەوە[١]. بەڵام هەندێک گەڕیدەو گەشــتیاری خۆرئاوایی تێبینی لەمجۆرەیان لەبەرچاو نەگرتوەو لەیاداشــتنامەو سەفەرنامەکانیاندا، ڕێبازو شێوزای بیرکردنەوەی وەهابییەکانیان بەڕێبازی محەمەدی ناوبردوە [٢].

هەوادارانــی محەمەد عەبدولوەهــاب، لەبری ناوی وەهابی، کەیف خۆشــن بە ناوی (سەلەفی)، واتە: شوێنکەوتوانی پێشینو (موحدین)، واتە: یەکتاپەرستان ناوببرێن[٣]، خۆشــیان لەبەرهەمو گوتارەکانیاندا، زیاتر وەک شوێنکەوتەی پێشین (سلف) باس لەڕێبازی خۆیان دەکەنو بەمە خۆیان بەخەڵکی موسوڵمان، دەناسێنن.

بەڕای مێژونوســانو شارەزایان، میسرییەکانو تورکە عوسمانییەکان رۆڵی بەرچاویان هەبوە لەدابڕینی ناوی وەهابی بەســەر بزوتنەوەو بانگەوازی محەمەد عەبدولوەهابدا. واش دەردەکەوێت، هەردولا مەبەستیان ئەوەبوە، بەهۆی زاراوەو ناوی نامۆی (وەهابی) یــەوە لەنێو قوتابخانە شــەرعزانییەکانی ئیســلام، قوربو بۆچونەکانــی بزوتنەوە سەلەفییەکەی محەمەد عەبدولوەهاب، لای رای گشتی موسوڵمانان، لەکەدارو قێزەون بکەن، چونکە لەگەڵ خواســتو ئەجێندای ئەواندا وێکنەدەهاتەوەو بگرە وەک دواتر رونیدەکەینەوە، لەچەند تەورەیەکدا دژیان دەوەستایەوە.

بەهەرحاڵ، وەک وتراوە ناو، هیچ پەیوەندی بەناوەڕۆکەوە نییەو ئەم دەمەقاڵەی لەسەر ناوی ئەم بانگەوازو بیرە ســەلەفییە هەیە، بەرکوڵێکو شــتێکی سادەیە لەچاو ئەو هەراو کێشمەکێشەی کە لەسەر شوناسو شەرعیەتو نێوەڕۆکی خودی بیروبۆچونەکە، لەئارادایەو لەنێو سەرچاوە ئاینیو مێژوییە هاوچەرخەکاندا، بەرچاو دەکەوێت.

هەر یەک لە (نیبور)و (زویمەر) ی سەردەستەی مژدەدەرەکانی مەسیحی لەرۆژهەڵات، بەجیا، قوتابخانەی محەمەد عەبدولوەهابیان بە «ئاینو ئاینزایەکی نوێو سەربەخۆ»،

---

١. ابو مسعود الندوی: هەمان سەرچاوەی پێشو، ل ٨٧.

٢. الامیر شکیب ارسلان: ملحق تأریخ ابن خلدون، ل ٧٧، وەرگیراو لە ابو مسعود الندوی: هەمان سەرچاوەی پێشو، ل ٨٧

٣. د. عبدالله عبدالمحسن الترکی: هەمان سەرچاوەی پێشو، ل ٤٠.

شرۆڤەو باســـکردوە[1]. هەندێکیشتریش وەک ئاینزای پێنجەمی ئەهلی سوننەو لەدوای ئاینزاکانی شافیعی، مالیکی، حەنەفی، حەنبەلی، پۆلێنی دەکەن[2]. بەڵام هیچ کام لەم شـــوناس‌و پۆلێنانە بەلای پێشـــەواو ڕێبەرەکانی بیری وەهابییەوە، قابیلی قبوڵکردن نییە.. ئەوان ســـورن لەسەر ئەوەی خۆیان‌و ڕێبازەکەیان بە درێژەپێدەرو تەواوکەری بانگەوازو ڕێبازی ئەهلی ســـوننەو ڕێبازی پێشـــینانی چاخە بەراییەکانی ئیســـلام، بناسێنن‌و لەقەڵەمبدەن. چونکە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، لەفەرمودەیەکی دروستدا، فەرمویەتـــی «خیـــر الناس قرنی ثم الذیـــن یلونهم، ثم الذین یلونهـــم». بەم پێیەش پێغەمبەر(صلی الله علیه وســـلم)، تەنها شایەتی چاکەی بۆ سێ نەوەی یەکەمی موسوڵمان داوەو تەنها تەزکیەی ئەم سێ نەوەیەی کردوە[3].

کۆباسی ئەو بۆچونانەی تائێستا لەسەر پێناسی بزاڤی وەهابی تۆمارکراون‌و لەئارادان، لەســـەر ئەوە کۆکـــن، وەهابییەکان، بزاڤێکی ئیســـلامی ســـەلەفیی موحافیزکارن.. بانگەشـــەی گەڕانەوە بۆ ئیسلامی ڕەســـەن دەکەن. ئەم ئیسلامەش بەلای ئەوانەوە مەرجە بەپێی تێگەشـــتنی پێشینانی ئیســـلام بێت لەدەقەکانی قورئان‌و سوننەت[4]. ئامانجی ڕاگەیەنراوو ئاشـــکرای ئەم بانگەوازە، پاکژکـــردن‌و بژارکردنی عیبادەتەکانی ئیسلامە لەو زیادانەی پاشینە موسوڵمانەکان، پێیانەوە لکاندوە. لەسەرو ئەمەشەوە، ئامانجی ســـەلەفییەت، تایبەتکردنی هەمو چەشنە پەرستن‌و هیوایەکە، تەنیا بەخوای تاکو بەدورگرتنی خودایە لەهەمو چەشنە شەریک بۆدانان‌و ڕەتکردنەوەی بونی هەمو جۆرە نێوانگرێکی گریمانکراوە، لەنێوان خواو بەندەکانی خۆی[5]. سەلەفییەکان هێندە دژی ســـەرقاڵبونی خەڵکن بەنێوانگرە گریمانکراوەکانی نێـــوان بەندەکان‌و خوداوە، ڕێـــگا نادەن خەڵک پێغەمبەران‌و پیاوچاکـــە نێودارەکانیش بکەنە جێگای ڕازو نیازو پاڕانـــەوەو تکای خۆیـــان[6]. بەڕای ئەوان دەبێت هەمو عیبادەتـــەکان، تایبەت بکرێن بەخوداو لەمەشـــدا چەندین دەقی ئاشـــکراو ڕاشـــکاوی قورئان‌و فەرمودەی دروست،

١. ابو مسعود الندوی: محمد بن عبالوهاب، ل ١٦٥.

٢. محمد بن جمیل زینو: منهاج الفرقة الناجیة والطائفة المنصورة، ل ٤٨.

٣. بڕوانە أبی عبدالله عامر بن عبدالله فالح: معجم ألفاظ العقیده، ل٤٤١.

٤. د. عبدالوهاب الکیالی: الموسوعه السیاسیه، ل ٣٥٧ ـ ٣٥٨.

٥. الندوه العالمیه للشباب الاسلامی: الموسوعه المیسره فی المذاهب والادیان المعاصره، ل ٤٥.

٦. أحمد بن زینی دحلان، فتنه الوهابیه، ل٥.

دەکەنە بەڵگەو پاســـاو، کە لەبەشی دووەمی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا ئاماژە بەهەندێکیان دەکەین.
هیچ ناکۆکییەکی ئەوتۆ لەئارادانییە لەسەر ئەوەی، محەمەد عەبدولوەهابی نوێکەرەوەی بیری سەلەفی، لەنیوە دورگەی عەرەب، شەرعزانێکی سەر بە ئایینزای حەنبەلییە[1] *.
ناوبراو، لەیەکێک لەنوســـینەکانیدا راشکاوانە گوزراشت لەم راستییە دەکاتو دەڵێت «ئایینزای ئێمە، ئاینزای ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەلی پێشـــەوای ئەهلی سوننەیە. لاریمـــان لەشـــوێنکەوتوانی ئاینزاکانیتریش نییە، ئەگـــەر بۆچونەکانیان پێچەوانەی دەقی قورئانو فەرمودەو کۆڕای زانایانی ئیســـلام نەبێـــت»[2]. ئەو بەرهەمە فیقهیو شەرعناسیانەشی لەمحەمەد عەبدولوەهابەوە بەجێماون، تێکڕا لەسەر رێسا باوەکانی ئاینزای حەنبەلی نوسراونو ئەم مەزهەبەیان کردۆتە سەرچاوەو مەرجەع. تائێستاش هیچ نوســـینو بەرهەمێکی محەمەد عەبدولوەهاب، دەســـت لێکۆڵەران نەکەوتوە کە بۆنی ئەوەی لێ بێت ناوبراو، هەوڵیدابێت مەرجەعیەتێکی نوێو ســـەربەخۆی فیقهی دامەزرێنێت، بەڵکە بەعەقیدە سەلەفیو بەمەزهەب حەنبەلی بوە. ئەمەش بەرپەرچی ئەو بۆچونە دەداتـــەوە کە پێی وایە قوتابخانەو بانگەوازی وەهابی ئاینزای پێنجەمی سوننەکانو لەچوار ئاینزاکەیتری سوننە سەربەخۆیە.
ئیمـــام ئەحمەدی کوڕی حەنبـــەل، کە محەمەد عەبدولوەهاب، کردبویە ســـەرچاوەو مەرجەعی ئاینییو شـــەرعیی بانگەوازەکەی، کەڵە زانایەکی دژەباوی سەردەمی خۆی بوەو ســـەرباری ئەشـــکەنجەدانی زۆری، بەهەمو توانایەک، بەگژ گوتاری خەلافەتو

1. جعفر السبحانی: مع الوهابیین، ل١٥. هەروەها د. عبدالکریم رافق: المشرق العربی فی العهد العثمانی، ل٢٤٨ ـ ٢٥٠.

* ئاینزای حەنبەلی، چوارەم ئاینزای ئەهلی سوننەیەو لەسەردەستی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، دمەزراوە. بنەماکانی ئەم ئاینزایە بریتین لەدەقی قورئان، سوننەت، فەتوای هاوەڵانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)، قیاس. ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لەساڵی ١٦٤ کۆچی لەبەغدا لەدایکبوەو ساڵی ١٨٧ کۆچی لەبەردەســـتی ئیمام شافیعی پلەی پێشەوای وەرگرتوەو دەستیکردوە بەفەتوادان.
بڕوانە:
ابو الحسن علی الحسنی الندوی: رجال الفکر والدعوه فی الاسلام ل١٢٥ ـ ١٣٠، المنجد فی اللغه والاعلام ل٦ـ ٧.

2. عبدالعزیز زید الرومی وآخرون: مولفات الشیخ الامام محمد بن عبدالوهاب، القسم الخامس، الرسائل الشخصیه، ل١٠.

موعتەزیلـــەدا چۆتەوە کە ئەیانوت، «خودا ســـیفەتی قســـەکردنی نییەو قورئانیش مەخلوقو دروستکراوە». ئیمام ئەحمەد، راڤەکردنی فەلسەفیانەی یۆنانیانەی بۆ باسو بابەتەکانی عەقیدەی ئیسلامیی رەتدەکردەوەو لەم بۆچونەشدا، تەنها چەند کەسێکی کەمی ســـەردەمەکەی پشـــتگیرییان لێکردوە. ناوبراو، جگە لەشـــەرعزانیی زانایەکی فەرمودەناســـیش بوەو چل هەزار فەرمودەی لەدوتوێی (المســـند) دا کۆکردۆتەوە. لەماوەی ژیانیشـــیدا (٧٨٠ ـ ٨٥٥ زاینی)، لەســـەر دەســـتی خەلیفەکانی عەباسی: مەئمون، موعتەســـەم، واسیق، لەسەر بۆچونە ســـوننەتیو دەقگەراییەکانی دوچاری ئەشـــکەنجەو زیندانکردنو ئاوارەیی بۆتەوە.. دوو ســـاڵو چـــوار مانگی ژیانی لەنێو تاریکاییو خەموژانی گرتوخانەدا بەســـەربردوە، جارێکیان بەدیارچاوی خەڵکەوە، ٨٠ شـــوڵی قایمی لێدراوەو تامردن بەدەم ئازاری ئەم ئەشـــکەنجانەوە تلاوەتەوە، بەڵام ئامادەنەبوە ســـازش لەبۆچونەکانی بکاتو تا گیان سپاردن هەر لەسەر جێگیرکردنی ســـیفات بۆ خودا ســـوربوەو دژ بەهەژموونی فەلسەفە بەسەر بیروباوەڕی ئیسلامیدا، وەستاوەتەوە. ساڵحی کوڕی ئیمام ئەحمەد دەگێڕێتەوە، کاتێک کە خەلیفەی عەباسی زانا ئاینییەکانی ناچارکردوە، تەفســـیری فەلســـەفی بۆ قورئان پەسەندبکەنو بڵێن «قورئان دروســـتکراوی خوایە نەک قســـەو کەلامی خوا»، تەنها باوکیو محەمەدی کوڕی نوح، ملیان بۆ ئەم وتەیە نەداوە، لەســـەر ئەمەش لەزیندان توندکراونو لەوێ بەشمقاڕو شوڵ ئەشکەنجە دراون، بەڵام هەر لەسەر قسەی خۆیان سوربون. جارێکیان نوێنەرەکەی خەلیفە بەئیمام ئەحمەدی وتوە: ئەگەر شمشێرت لێ راکێشین بەبۆچونی موعتەزیلە رازی دەبیت؟ ئەویش وتویەتی: نەخێر شمشـــێریش لەسەر گەردنم دابنێن لەقسەی خۆم پەشـــیمان نابمەوە. هەروەها سەرچاوە مێژوییەکان دەگێڕنەوە، ئیمام ئەحمەد لەبەردەم خودی خەلیفە موعتەســـەمدا بوێرانەو بێ منجەمنجکردن داکۆکیی لەبۆچونەکانی خۆی کردوە، خەلیفەش فەرمانیکردوە، شەلاق بدرێت، بەڵام شەلاقدانو ئەشکەنجەدان زەرەیەک کاری تێنەکردوەو هەر لەسەر باوەڕی خۆیو راڤەی سەلەفیانەی قورئانو لەســـەر جێگیرکردنی سیفاتی قسەکردنو بیســـتنو بینینو....هتد. بۆ خوا سوربوە[1]. دەگێڕنەوە، کاتێک جەللادەکانی خەلیفە، یەکەم شەلاقیان لەئیمام ئەحمەد داوە، هاواریکردوە: بەناوی خوا. دوای دوەم شەلاق وتویەتی: لاحول ولاقوە الا بالله، لەدوای سێیەم شەلاق هاواریکردوە: قورئان، فەرمودەو وتەی خوایەو دروستکراو نییە.

---

١ـ جلال الدين عبدالرحمن السيوطي: تأريخ الخلفاء، ل٣١٢. هەروەها سيره الامام أحمد بن حنبل: صالح بن أحمد بن حنبل.

لەدوای چوارەم شـــەلاقیش ٍوتویەتی: جگە لەوەی خوا بۆی نوسیبین توشمان نایە..
«قُلْ لَنْ يُصِيبَنَا إلاَّ مَا كَتَبَ اللّه لَنَا». التوبة :٥١.
ئەبوحەسەنی ئەشعەریی لەکتێبەکانی (الابانە)و (مقالات الاسلاميين) دا رونیدەکاتەوە، پوختەی بۆچونی ئیمام ئەحمەد، لەسەر دو کۆڵەکە بنیاتنراوە، یەکەم: شوێنکەوتنی دەقەکانی قورئانو فەرمودەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسـلم )، دوەم: شـــوێنکەوتنی وتەو هەڵوێســـتی سەحابەو پێشەوا فەرمودەناســـەکان. ئەبو حەسەن، کە پێشتر چەندین ســـاڵ نەیاری بیرکردنەوەی ئیمام ئەحمەد بوە، پاش ئـــەوەی لەبۆچونە عەقڵانییو فەلسەفییەکانی پاشـــگەزبویەوەو بەرەی موعتەزیلەو ئەشـــعەرییەکانی بەجێهێشت، کەوتە ستایشکردنی ئیمام ئەحمەدو لەتاریفیدا دەڵێت «ئیمامی زێدە بەڕێزو سەرۆکی گەورە.. خودا راســـتی پێ رۆشـــنکردەوەو تاریکیو گومڕایی پێ لەناوبرد.. پشـــتی بیدعەچییەکانی شـــکاندو ڕێبازی ئیســـلامی رۆشـــنکردەوە.....». هەروەها لالەکائی لە (شرح أصول السنه) دا دەگێڕێتەوە کە ئیمام ئەحمەد، وتویەتی «بنچینەی سوننەت لای ئێمە، شـــوێنکەوتنی ســـەحابەکانو وازهێنانە لەبیدعە، چونکە هەمو بیدعەیەک گومڕاییە».
ئیمام ئەحمەد، تێڕوانینی شـــەرعزانیی خۆی لەسەر کۆمەڵێک سەرچاوە بنیاتناوە کە بریتین لە: قورئان، فەرمودەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسـلم )، تێگەشتنو رای سەحابەو زانایانی پێشین. بەم هۆیەشەوە قوتابخانەکەی بە نزیکترین ئاینزای ئیسلامی لەدەقەکانی قورئانو فەرمودەوە، ناوبانگی دەرکردوە. ئیمام ئەحمەد، هێندە پەیوەســـتو هۆگری دەقە، زۆر بەدەگمەن لەپرسەکانی پەیوەست بەعیبادەتدا پەنا بۆ قیاس دەبات. لەهەر بوارێکیشدا فەتوای سەحابەو تابعینو زانایانی پێشینی دەستکەوێت، وەک خۆیو چۆن پێی گەشـــتوون، پەیڕەوییان لێدەکاتو هیچ راوبۆچونێکی تازەی خۆی ناخاتەســـەر، چونکە پێی وابو ماقووڵ نییە خەڵک بەگوێرەی راوبۆچونو قیاس، خواپەرستی بکەن. بەڵکە دەبێت شوێن سوننەتو دابو دەستوری پێشینانی ئیسلام بکەونو تاڵەمویەک لێیان لانەدەن. لەیەکێک لەراســـپاردەکانیدا بـــۆ عەبدولرەحمانی کوڕی مەیمون، کە شـــەرعزانێکی هاوچەرخی خۆیەتی، نوسیوتی «نەکەی لەخۆتەوە شتێک بڵێیت، هیچ پێشەوایەک بەرلەتۆ نەیانوتبێت». ئیمام ئەحمەد لەبۆچونەکانیدا دەربارەی عیبادەت، ئـــەو فەرمودانەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسـلم )، لەبەرچاودەگرێت کە دەفەرمون «صلوا كما رأيتموني أصلي» واتە: من چۆن نوێژ ئەکەم، ئێوەش ئاوەها بیکەن. «خذوا عني مناســـككم» واتە: رێوشـــوێنی حەجکردنتان لەمن وەرگرن. رەنگە لەم میانەیەشدا،

هەندێــک کەس خەیاڵیان بۆ ئەوە بچێت، وابەســـتەیی زۆری ئیمام ئەحمەد، بەدەق‌و رای زانایانی پێشـــین‌و دورەپەرێزگرتنی لەداهێنانکاریی ئاینیـــی، لەکەمی زانیاریی‌و لاوازییەوە، ســـەرچاوەیگرتبێت.. بەپێچەوانەوە، ئیمام ئەحمەد، زاناترین شـــەرعزانی دەوروبەرەکەی‌و بەغدا بوە، بەڵام رێبازی پەسەنکراوو هەڵبژاردەی ئەو، شوێنکەوتنی پێشینانەو لەچەندین سەرچاوەدا هاتوە کە ئیمامی شافیعی لەبارەیەوە وتویەتی «من بەغدام بەجێهێشت، کەسی باشترو شارەزاترو شەرعزانتری لەئەحمەدی کوڕی حەنبەل تێدا نەبـــو». هەروەها ئیبن جەوزی دەگێڕێتەوە: ئیمـــام ئەحمەد بەکوڕەکەی وتوە «فەرمودەم بۆ بخوێنەوە، تا من سەنەدەکەیت پێ بڵێم.. سەنەدم بۆ بخوێنەرەوە تا من فەرمودەکەیت پێ بڵێم».

ســـەلەفییەکان هەمان جیهانبینی‌و تێڕوانینە ســـونەتییەکانی ئیمام ئەحمەدو لەدوای ئەویش ئیبن تەیمیەو زانا سەلەفییەکانیتری ئاینزای حەنبەلی درێژە پێدەدەن[1]، کۆی بۆچون‌و بیردۆزی ئاینیی شوێنکەوتوانی محەمەد عەبدولوەهاب، لەمێژوی کۆن‌و نوێدا، لەراڤەکردن‌و رونکردنەوەی بۆچونە ئاینییەکانی ئاینزای حەنبەلی‌و بۆچونەکانی ئیبن تەیمیە، بەولاوە هیچیترنییە[2].

ئیبن تەیمیەی مامۆســـتای دووەمی ســـەلەفییەت کە محەمەد عەبدولوەهاب، هێجگار پێی سەرســـام بوە، «کەڵە زانایەکی بێ وێنەی نێو مێژوی ئیســـلامە«. ئەم زانا کە بەبنەچە کوردی رۆژئاوای کوردســـتانە، بەهەمانشـــێوەی ئیمام ئەحمەد، لەسەدەی حەوتەمی کۆچیدا، لەوڵاتی شـــام، شۆڕشـــێکی گەورەی ئاینی‌و مەعریفی بەرپاکردوە کە نێوەڕۆکەکەی چەســـپاندنی یەکتاپەرســـتی‌و بەگژاچونەوەی شـــێوازی پەرستن‌و بیرکردنەوەی سۆفیگەریی‌و شیکاری فەلســـەفیانەی دەقە پیرۆزەکانی ئیسلام بوە[3].

ئیبـــن تەیمییە، نەک هەر سەرســـەختانە داکۆکی لەگەڕانەوە بۆ کلتوری ســـەحابەو تابعین‌و شوێنکەوتوانی تابعین، کردوە، بەڵکە هێرشی توندو یەکلاکەرەوەشی کردۆتە ســـەر نەیارانی بیری سەلەفی‌و خاڵی لەســـەر پیتەکان داناوە. بەهەمانشێوەی ئیمام ئەحمەدیش، لەســـەر ئەم هەڵوێستو بۆچونە ســـوننەتیانەی لەشارەکانی دیمەشق‌و

---

١. كارل بروكلمان: تاريخ الشعوب الاسلاميه، ل٥٤٩.

٢. ٢٦. موسى بن عبدالله آل عبدالعزيز: اضواء على دعوه محمد بن عبدالوهاب، مجله السلفيه العدد ٢، الرياض ١٤١٧ ه، ل ٩٠ ـ ٩٨.

٣ــ بڕوانە: أبى الفلاح ابن عماد الحنبلى: شذرات الذهب فى انباء من ذهب، ل٨٣ ـ ٨٥.

قاهیـــرە، خراوەتە نێو زیندانو ڕۆژگارەکانی کۆتایی ژیانیی بەنەخۆشـــیو هیلاکیی لەنێو گرتووخانەی قەڵای دیمەشقدا بەسەربردوە، تا ڕۆژێک کە پاسەوانەکان دەرگای گرتوخانەکەیان کردەوە، دەبینن دەمێکە گیانی سپاردوە. بەرهەمەکانی ئیبن تەیمیە، لەدەیان کتێبو فەتواو نامەو ڕونکردنەوە پێکدێن، ناوبراو، هێندە وردبۆتەوە لەشیکاری پرسو بابەتە عەقیدەییەکاندا بواری بۆ لێکدانەوەی زیاتر نەهێشتۆتەوەو بەشێوەیەکی بەربڵاو لەنوســـینەکانیدا زاراوەی «ســـەلەف»، «ڕێبازی سەلەف»، «بیرکردنەوەی سەلەف»ی بەکارهێناوە.. بەگژ بنەماکانی خواپەرستی سەردەمی خۆیدا چۆتەوە کە لەســـۆفیگەریو فەلسەفەکاریو داهێنانی عیبادەتدا خۆی بینیوەتەوە. ئیبن تەیمییە، پوختەی ڕێبازی کارکردنو بیرکردنەوەی خۆی لەدێڕێک هەڵبەســـتدا کۆکردۆتەوە کە دەبێژێت: «وکل خير في اتباع من سلف::: وكل شر في ابتداع من خلف»، واتە: هەمو چاکەیـــەک لەشـــوێنکەوتنی پێشـــیناندایە:::هەمو خراپەیەکیـــش لەبیدعەی پاشـــینداية، نێوەڕۆکی کۆی بەرهەمەکانی ناوبراو، بریتییە لەچەسپاندنی تێگەشتنی ســـەلەفو پێشینان بۆ بیروباوەڕی ئیســـلامیو بەگژاچونەوەی پەنابردن بۆ گۆڕو بۆ پیاوچاکان، دیارترین بەرهەمەکانیشی بریتین لە:

١ـ (درء تعارض العقل والنقل) کە ڕەتکردنەوەی بۆچونی فەیلەسوفانو بەرپەرچدانەوەی فەخرەدین ئەلرازییە.

٢ـ (منهاج السنه النبويه) کە تێیدا خاڵ بەخاڵی باوەڕی شیعەی داوەتە بەر ڕەخنەو بەبەڵگەو سەلمێنراوی شەرعیی هەڵیوەشاندونەتەوە.

٣ـ (بیـــان تلبيس الجهميه) تێیدا بەگـــژ هەمو ئەو بۆچونو لێکدانەوانەدا چۆتەوە کە لەگەڵ تێگەشـــتنی پێشینانی ئیسلامو ڕێبازی ســـەلەفیدا ناکۆکن، پاش وردبونەوەی زۆریـــش لەلۆژیکو مەنتیقی یۆنانـــی، جەختی کردۆتەوە کە هیچ ســـودو قازانجێک لەلۆژیکو زانســـتی مەنتیقدا نییە، لەمبارەیەشـــەوە کتێبە بەناوبانگەکەی (الرد على المنطقيين) ی داناوە. د. موحسین عەبدولحەمید، لە (نوێکردنەوەی بیری ئیسلامی) دا لەبارەی کارنامەو شۆرشە ئاینییەکەی ناوبراوەوە، دەڵێت «خوا ویستی وەهابو، لەسەر دەستی کەڵەپیاوێکی وەک ئیبن تەیمییە، ئەم ئاینە پاکەی خۆی جارێکیتر لەو هەمو فەرهەنگو کەلتورە چەواشەکارانە ڕزگاربکات کە ریشەیان دەگەڕایەوە بۆ چەرخی بت پەرســـتی». هەروەها ناوبراو پێی وایە «لەسەراپای مێژوی ئیسلامیدا زانایەکیتری بوێرو شارەزای وەک ئیبن تەیمییە دەست ناکەوێت»، هەر بۆیە ئەڵێ «ئیبن تەیمییە توانی جارێکیتـــر ئەم بیروباوەڕە بکێشـــێتەوە بەدەقە قورئانیو ســـوننەتییەکانداو

لەچوارچێوەی کۆمەڵە ڕێسایەکدا کە زانایانی ئیسلام لەسەری یەکدەنگ بون بخاتەوە بەردەستی موسوڵمانان».

کاریگــەری ئیبن تەیمیەو ئیبن ئەلقەیمی خوێندکاری بەســەر بزاڤــی وەهابییەکانی نەجــدەوە، هێجگار بەرفراوانو قوڵە، بەجۆرێــک محەمەد عەبدولوەهاب، لەبارەی ئەم پەیوەندییەوە دەڵێت «هەردو پێشــەوا ئیبن ئەلقەیمو ئیبن تیمیەی مامۆســتای، دو ڕێبەری ڕاستەقینەی ئەهلی سوننەنو لای ئێمە کتێبەکانیان، پڕبایەخترین سەرچاوەو بەرهەمــن»[1]*. وەک لەتوێژینەوە بەراوردکارییەکانیشــەوە دەردەکەوێت، لێکچونو نزیکییەکــی لەڕادەبەدەرو زۆر لەنێوان نوســینو بۆچونەکانی محەمەد عەبدولوەهابو ئیبن تەیمیەدا، هەیە[2].. تائیســتا نەبیســراوە هیچ نوســەرێکی ئاینیو شەرعزانێکی هاوچــەرخ، وەک محەمــەد عەبدولوەهاب، تێزو بۆچونەکانی ئیبــن تەیمیەی، راڤەو جێبەجێ کردبێ[3]، بۆیە زۆرێک لەشــارەزایانی بیری ئیســلامی پێیان وایە، جیاوازی

١. سلیمان بن سحمان النجدی: هەمان سەرچاوەی پێشو، ل ١١٥ ـ ١١٧.

* ناوی محەمەدی کوڕی ئەبوبەکر ئەیوبەو لە٦٩١ ک، لەشــاری دیمەشــقی پایتەختی ســوریا لەدایکبــوەو یەکێکە لەنێودارترینو ناســراوترین خوێندکارەکانی ئیبن تەیمیە. ئیبن قەیم، جگە لەئیبن تەیمیە لای گەورە زانیانی حەنبەلی خوێندویەتیو لە٧٥١ ک، کۆچی دواییکردوە.

٢. بڕوانە بەرهەمەکانی محەمەد عەبدولوەهاب: مســائل الجاهلیە، کتاب التوحید، کشف الشبهات، کە بەئاشکرا لەژێر کاریگەری فەتواو بۆچونە ئاینییەکانی ئیبن تەیمیەدایە

٣. د. عبدالکریم رافق، المشرق العربی فی العهد العپمانی، ل٢٩.

* ناوی شــیخ الاســلام تقی الدین احمد بن عبدالحلیم بن عبدالســلام بن تیمیە یە، لەدایکبوی ٦٦١ ک، گوندی حەڕانی کوردســتانی سوریایە. لەتەمەنی منداڵیو لەترسی شاڵاوەکانی مەغۆل لەگەڵ خێزانەکەیدا کۆچیکردوە بۆ دیمەشــق. بابو باپیرانی ئیبن تەیمیە شــەرعزانو موفتی حەنبەلی بونو ســودی زۆریان بــە ئیبن تەیمیە گەیاندوەو بەم هۆیەوە لەتەمەنی ١٩ ســاڵیدا پلەی موفتی دیمەشــقی وەرگرتوە. ناوبراو سوارچاکی زانسەکانی قورئان، فەرمودە، شەرعزانی، گەردونناســی، لۆژیک، فەلسەفە، بیرکاری، تەفسیری قورئان، مێژوو.....هتد. بوەو لەکۆی ئەم کایە مەعریفیانەدا نوســراوی هەیە. نزیکەی ٣٠٠ بەرگ بەرهەمو نوســراوی جۆربەجۆری هەیەو لە ٦٩٩ ک، ســەرۆکایەتی وەفدی دیمەشــقی کردوە بۆلای قازان خانی مەغۆلو لە ٧٠٢، بۆتە فەرماندەی ســوپا بۆ موقاوەمەکردنی مەغۆلو لە٧٢٨ک، لەنێو قەڵای دیمەشــقو لەبەندیخانەدا کۆچــی دواییکــردوە. بۆ زیاتر بڕوانە: زیــن الدین مظفر عمر ابن الــوردی: تأریخ ابن الوردی، ج٢،ل٢٧٤. هەروەها أبی الفلاح عبدالحی ابن عماد الحنبلی: شذرات الذهب، مجلد٣، ل ٨٣ـ ٨٥.

نێوان بانگەوازی ســـەلەفییانەی محەمەد عەبدولوەهابو ئیبن تەیمیە*، تەنها سەدەو ســـەردەمو ژینگەی سیاســـیو کۆمەڵایەتییە، چونکـــە ئیبن تەیمیـــە لەژینگەیەکی شارستانیی وەک دیمەشقو لەدەمی شاڵاوەکانی مەغۆلدا بانگەوازی بۆ سەلەفیگەریی دەکرد، بەڵام محەمەد عەبدولوەهاب، لەژینگەیەکی بیابانییو لەســـەردەمی دەسەڵاتی تورکە عوسمانییەکاندا، کەوتە جموجوڵو بانگەوازو لایەنگر پەیداکردن.

پـــاش ئەم گـــوەزەرە خێرایـــەش بەپاشـــخانی فیکریـــی محەمـــەد عەبدولوەهابو بانگەوازەکەیدا، بەشێوەیەکی گشتی، دەکرێت بڵێین: بیری وەهابیی شۆرشێکی ئاینی گەورەو تێڕوانینێکی پشـــت ئەســـتورە بەبیروباوەڕی پێشـــینانی ئیسلامو پێی وایە: چاکســـازی ئاینیو رۆحیی، زامنی چاکبونی رەوشـــی سیاسیو کۆمەڵایەتییە، چونکە بەبۆچونـــی ئەوان، وەک ئیمامـــی مالیک دەڵێت «کۆتایی ئـــەم ئوممەتە تەنها بەو شـــتانە چاک دەبێت کە پێشـــینانی پێ چاک بوە». ئەم بیرە سەلەفییە، دەیەوێت بیرکردنەوەو کۆمەڵگایەکی هاوچەشـــنو هاوشێوەی کۆمەڵگاو بیروبۆچونەکانی چاخە پێشـــینەکانی ســـێ ســـەدەی یەکەمی ئیســـلام فەراهەم بهێنێت، هەر لەبەرئەمەش بەسەلەفیو شوێنکەوتوانی پێشینان دەناسرێت.

# هەلومەرجی سەرهەڵدانەوەی بانگەوازی سەلەفی

دوای بەغداو شام، بانگەوازی سەلەفی لەنێوچەیەكدا سەریهەڵدا كە لانكەی یەكەمی ئاینیو ئیسلامو پێگەی پیرۆزترین مەڵبەندە ئیسلامییەكانە كە نیوە دورگەی عەرەبییە. بەپێی گێڕانەوە زۆرو جۆراوجۆرەكان، ئەم پانتاییە جوگرافیو مێژووییە لەدەمی سەرهەڵدانی بانگەوازی وەهابیدا، بەئاگری شەڕو كێشمەكێشە خێڵەكییەكانو هەراو كوشتو بڕی نێوان كۆچەریو شارنشینەكان دەسوتا. ئەو میرنشینانەی لەدەمی سەرهەڵدانی بیری وەهابیدا لەنێوچكەدا هەبون، هەریەك لەهەوڵی پاراستنی سەربەخۆییو پاراستنی دەسەڵاتی نێوچەیی خۆیاندابون. لەم میانەیەشدا ڕێبەرەكانی بیری وەهابی سەلەفی گرنگیان بەخەڵكە شارنشینو تێگەشتوەكان دەداو لەبنەڕەتیشەوە بیری وەهابی لەنێو ژینگەی سیاسیو كۆمەڵایەتی هەرێمی نەجدی شارنشیندا سەریهەڵدا[1].

هەرچەندە جوگرافیاو لانكەی یەكەمی، بیری وەهابی، وڵاتی سعودیەی ئێستاو نیمچەدورگەی عەرەبییە، بەڵام گوتاری ئەم بانگەوازەو رایەڵە فیكریو كلتورییەكانی لەم پانتاییەدا قەتیس نابێتو لەگەڵ دەستبەكاربونیدا هەوڵیداوە بپەڕێتەوە بۆ تێكڕای پانتاییە ئیسلامییەكانیتری سنوری قەڵەمڕەوی خەلافەتی عوسمانی، كە كتومت، گیرۆدەی دەست بارودۆخی جۆراوجۆری هاوشێوەی بارودۆخی نیوەدورگەی عەرەببونو ئەوانیش پێویستیان بەگۆڕانو چاكسازی هەبو[2].

رەنگە بۆ دیاریكردنی بارودۆخی نیمچە دورگەی عەرەب، لەدەمی سەرهەڵدانەوەی بیری سەلەفیدا، گەڕانەوە بۆ شایەتە ئەوروپیو رۆژئاواییەكان باشترین شت بێت، چونكە ئەودەمە سوپایەك گەریدەو رۆژهەڵاتناس بەناوو پاساوی جۆراوجۆرەوە زو زو بەنیمچە دورگەی عەرەبیو بیابانەكانیدا گەشتیان دەكردو دەگەڕان. لەنێو ئەم رۆژئاواییانەشدا نوسەری ئەمەریكی توثروب ستودار، (Tothrop stoddar)، لەهەمویان باشتر گوزارشتی لەبارودۆخی نوتەكی نیمچە دورگەی عەرەب لەوكاتەدا كردوەو دەڵێت «پەردەیەكی رەش بەسەر ئایندا دارایدا درابو، جیهانی ئیسلام مۆڵگەی

---

١ـ د. عبدالكريم رافق: المشرق العربي، ل٢٤٨.

٢ـ هەمان سەرچاوەی پێشو، ل٢٣٢ ـ ٢٣٥.

ئەفسـانەو نەزانین بو، مادده سرکەرو هۆشبەرەکان، بەهەمولایەکدا تەشەنەیانکردبو، مەککـەو مەدینە لەهەمو جێگایەک زیاتر بوبونە مۆڵگەی خراپەکاری. حەجکردن کە گەورەترین پەرستشـی ئیسلامە، جێگای نوکتەو گاڵتەجارِی خەڵک بو»[1]. نوسەرو نیگارکێشـی بەناوبانگی بەریتانـی هوغارثیش، لەوێناکردنی ئەو باردودۆخەدا دەڵێت «هەسـتو سۆزی موسوڵمانان خەفەی کردبو، خەلیفە بێدەسەڵات بو، ئاینی ئیسلام لەپاشەکشەدابو»[2] .

بەپێی سـەرچاوە مێژوییەکان، ئەو دۆخە خراپەی کە ئەم دوو نوسـەرە خۆرئاواییە دەیخەنـەرِو، بەشـێوەیەکی بەرچاوترو قوڵتر، ناوچەکانی سـەر بەهـەردو هەرێمی نەجدو حیجازی گرتبوەوە، کە دوو هەرێمی دورەدەسـتبون لەئەستەنبولی پایتەختی خەلافەتی عوسـمانیو بەتەواوی فەرامۆشـکرابون. چونکە نەجـدو حیجاز، لەدەمی حوکمرِانی سوڵتان سەلیمی سێیەمداو لە١٥١٧ز، کە عوسمانییەکان چونە ناو میسر، بەرواڵەت، لکێنران بەدەسەڵاتی عوسـمانییەوەو هەربەناو، لەسەر قەڵەمرِەوی ئەوان ئەژماردەکران، بێئەوەی بەفیعلی دەسـەڵاتو پرِۆژەیـان لەم دو هەرێمەدا هەبێت[3] . بەدرێژایی مێژوی عوسمانییەکان، والیو کاربەدەستی عوسمانی راستەوخۆ بۆ نەجدو حیجـازو ناوچەکانیتری نیوە دورگەی عەرەب، دانەنـراوە[4]. تەنانەت بەڵگەنامەیەکی عوسمانی کە ساڵی ١٦٩٠ز، بەزمانی تورکیو لەژێر ناونیشانی «قوانین ئال عثمان در مضامین د فتر دیوان» نوسراوەو تایبەتە بە تۆمارو ئامارکردنی ویلایەتو ناوی والییەکانی دەوڵەتی عوسـمانی، بەهیچ جۆرێک باسی نەجدو حیجازی تێدا نەهاتوە[5]، لەکاتێکدا حیجاز، شـارەکانی مەککەو مەدینە لەخۆدەگرێتو لەهاتنی ئیسـلامەوە کاروانسەراو روگـەی هەزاران حاجیو زیارەتکەربوە. ئەو بۆشـایی دەسـەڵاتەش لەنیوە دورگەدا هەبوە، وەهایکردوە هەر شـارو خێڵێکی ناوچەکە، ئیمارەتێک بۆ خۆیان دامەزرێننو هەمو ئەم دەسەڵاتە ناوچەییانەش خۆرەی یەکتربونو دژبەیەکتر کاریانکردوە.

---

١. الامیر شکیب ارسلان: حاضر العالم الاسلامی، ل٣٤ وەرگیراو لە ابو مسعود الندوی: محمد بن عبدالوهاب، ل٢٣٣.

٢. ابو مسعود الندوی: هەمان سەرچاوەی پێشو، ل ١٥٧.

٣. محمد عتریس: معجم بلدان، ل٣١٢

٤. تحسین ابراهیم الدوسکی: مذکرات الجاسوس الانکلیزی همفر فی المیزان، ل ٤٩

٥. د. محمد حرب: العثمانیون فی التأریخ والحضارە، ل٥٣ - ٥٥

کۆی سەرچاوە متمانەدارە مێژوییەکان، باس لەوەدەکەن، نەبونی دەسەڵاتی راستەقینەی عوسمانییەکان، لەنیوە دورگەی عەرەبو لەگەڵیشیدا نەجدو حیجاز، پاشاگەردانیو بێسەروبەرییەکی زۆری لەم ناوچەیە بڵاوکردبۆوە کە کاریگەری خراپی کردبوە سەر بارودۆخە جۆربەجۆرەکانی ژیان. بۆ نمونە نەبونی هوشیاریو بێدەنگیی عوسمانییەکان وەهایکردبو، خەڵکێکی زۆر لەدەوری هەندێک لەدارخورماکانی نەجدو حیجاز کۆبنەوەو بەپیرۆزیان دەزانینو تەبەڕوکیان پێدەکردن. هەندێکیتریش لەخەڵک گۆڕو ئارامگای هاوەڵانو ئالو بەیتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)یان کردبوە جێگای کۆبونەوەو عیبادەتو پاڕانەوەی خۆیانو وەک شوێنی خوداپەرستی بەکاریاندەهێنان[1]. ئەو راپۆرتو بەڵگەنامە فەرمیانەی لەنێو کۆشکی فرمانڕەوایی عوسمانییەکاندا دۆزراونەتەوە، ئاماژە بەم راستیانەی سەرەوە دەکەنو ئەوە دەخەنەڕو کاتێک بزوتنەوەی وەهابییەکان سەریهەڵدا، بەشێوەیەکی گشتی، خەڵکی نیمچە دورگەی عەرەبی، سەرقاڵی گۆڕپەرستیو پارانەوەو پەنابردن بون بۆ پیاوچاکە مردوەکانو سۆفیگەریو گۆشەگیریی سیمای سەرەکی ژیانی خەڵک بوە[2]. زۆر لەبیرمەندەکانیش پێیانوایە عوسمانییەکان خۆیان هاندەرو پاڵپشتی نەریتو پەرستشە سۆفیگەرییەکانبون[3]، کە لەدیدو بۆچونی سەلەفییەکانی نەجددا پەرستشی ناکامڵو پڕ لەبیدعەبونو پێویستیان، بەگۆڕینو پێداچونەوەو گونجاندن هەبوە لەگەڵ دەقە دروستە شەرعییەکان[4].

بەپێی بەڵگە مێژوییەکان محەمەد عەبدولوەهاب، هەر لەسەرەتای دەرکەوتنی بانگەوازەکەیەوە، شێوازی عیبادەتو پاڕانەوەی سۆفیگەرانەی سەردەمی خۆی رەتدەکردەوەو پێداگریی لەسەر ئەوە دەکرد، «مردوەکان، ناتوانن هیچ بۆ زیندوەکان بکەن. تەنها زاتی «الله» کە پەروەردگارو پەرستراوی راستەقینەیە، دەتوانێت پێویستی خەڵک پڕبکاتەوەو بەدەم هاوارو هانایانەوە بڕوات»[5]. هەروەها خۆیو شوێنکەوتوانی پێیانوابوە، لەپاڵ بانگەوازکردنو بەئاگاهێنانەوەی خەڵکدا لەعیبادەتی

١ـ محمد بن جميل زينو: منهاج الفرقه الناجيه، ل٤٦

٢ـ د. محمد حرب: العثمانيون في التأريخ والحضاره، ل ٥٣

٣ـ محمد قطب: كيف نكتب التأريخ الاسلامي، ل ١٧٦

٤ـ كارل بروكلمان: تأريخ الشعوب الاسلاميه، ل ٥٤٩

٥ـ بڕوانە: محمد بن عبدالوهاب: كتاب التوحيد، ل ٤٣

نادروســـت، بەکارهێنانی هێزو شمشـــێر، دژ بەنەیارو ڕێگـــرەکان، هۆکارێکی گرنگی گەیاندنو چەسپاندنی یەپامی دروستی ئیسلامەو بەبێ بونی هێز، گۆڕان لەکۆمەڵگادا نایەتەدی[1]. هەر لەم میانەیەشـــدا وەهابییەکان، بەزەبری هێزو لەچوارچێوەی ئەوەی بـــە «گۆڕینی خراپە»، نێویاندەبرد، دەســـتیانکردە بڕینی ئـــەو درەختانەی خەڵک بەپیرۆزیان دەزانینو ئەو گومەزیو مزگەوتانەیان روخاند کە لەســـەر ئارامگاو گۆڕی ســـەحابەو پیاوچاکەکان بنیاتنرابون، ئەمەش وەهایکرد خەڵکە سادەو سۆفییەکان، بە«کافر»و «لەدین دەرچو»، ناویان ببەنو هەواڵیان بۆ ناوچەکانیتر بگوازنەوە[2]*. واش دەرئەکەوێـــت، ئەم هەنـــگاوەی وەهابییـــەکان، هۆکاری یەکەمـــی ئاڵۆزبونی

١. ٤٣ تحسين ابراهيم الدوسكي: مذكرات الجاسوس الانكليزي همفر...، ل٢٠

٢. ٤٤ جعفر السبحاني: مع الوهابيين، ل٤٣

* تاهەنوکـــەش کارمەندەکانـــی دەزگای «الامر بالمعروف واالنهی عن المنكر»ی ســـعودی کە بەپۆلیســـی ئاینی ناسراونو بیروباوەڕەکانی قوتابخانەی سەلەفی لەسعودیەدا جێبەجێ دەکەن، ڕێگری دەکەن لەو حاجیو زیارەتکەرانەی بەتەمان نزاو پاڕانەوەو پەرســـتش لەنێو گۆڕســـتانی بەقیعو لەســـەر ئارامگای ســـەحابەو لەنزیک ئارامگای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم )و ئەبوبەکرو عومـــەر، ئەنجامبدەن. ئەم کارمەندانە کە هەموویان راهێنراوو خاوەن زانیاری شـــەرعیو ئاینین، تاوێک بەئامۆژگاریکردنو تاوێکیتر بەپاڵو هێز لەم شوێنانە بڵاوە بەخەڵکو زیارەتکەران دەکەنو ئەوەیان بیـــر دەخەنەوە تەنها لەخودا بپاڕێنەوە. هەروەها ســـەرباری گرنگیو گەورەیی پێگەو ناونیشـــانی ئەوانەی لەم گۆڕانەدا نێژراون، هێشـــتا گۆڕەکانیان هەر گڵی سادەنو هیچ قوببەو بینایەکیان لەســـەر نییە. یەکێک لەگەورە بەرپرسەکانی دەزگاکە مانگی ٢٠٠٨/١٢ بەئاستەمو پاش چەندین پاکانە، گۆڕی ئیمام عوســـمانی کوڕی عەففانی پیشـــاندام کە زۆر سادەبوو باسی ئەوەیکرد، سەردەمی خەلافەتی تورکە عوسمانییەکان تەنها لەنێو بەقیعدا ٨٠ گومەزی زێرو زیو لەســـەر گۆڕی سەحابەکان هەبوە، بەڵام دواتر دەوڵەتی سعودی هەموی لابردوەو یەکسانیکردوە لەگـــەڵ زەوی بۆ ئـــەوەی خەڵک نەیانکەنە پەرســـتگاو جێگای پاڕانەوەو نزاکـــردن، هەروەها رونیکردەوە مەبەستی ئەوان ئەوەیە لەبری سەر ئەو گۆڕانە زیارەتکەران رو لەحەرەمی مزگەوتی مەدینە بکەن کە لەتەنیش گۆرستانەکەدایەو جێگا نوێژو پاڕانەوەی پێغەمبەرو هاوەڵەکانی بوە. هەر زیارەتکەرێکیش پرســـیاری خاوەنی گۆڕەکانی دەکرد، پۆلیســـەکان هەموویان یەک وەڵامی ئامادەکراویان هەبوە «گرنگ نییە، ئەو گۆڕە هی کێیە، گرنگ ئەوەیە ئەم گۆرســـتانە کۆمەڵێک ســـەحابەو پیاوچاکی تێدایەو ســـڵاویان لێبکەو بپاڕێرەوە خودا پلەیـــان بەرزتر بکاتەوەو ئیتر مەپرسەو مەوەستەو بڕۆ». ئەگەر کەسێکیش زۆر جەختی بکردایەتەوە لەسەر پیشاندانی گۆڕێک بـــۆ یادگاری ئەیانوت «دەڵێن گوایە ئەمە گۆڕی عوســـمانو ئەوە گۆڕی فلانو فلانەو خواش ئەزانێت وایە یان نا؟ کەس دڵنیا نییە».

پەیوەندییـــان بوە لەگەڵ زۆرێک لەخەڵک، دەوروبەر، چونکە تا ئەودەمەش هانابردن بۆ گۆڕو بەکارهێنانی وەک رایەڵی پەیوەندی نێوان بەندەو خوا، لای زۆرێک لەخەڵک بەشـــێکی دانەبڕاوو بنەڕەتیی بوە لەئاینو دەســـتبەرداربونی هەروا کارێکی ئاســـان نەبوە[١].

کێشەی وەهابییەکان، تەنها لەگەڵ خەڵکی ئاساییدا نەبوە، بەڵکە تێگەشتنو چەمکی ســـەلەفیانە، بۆ بیروباوەڕی ئیســـلامیو دەربارەی عەقیدە.. بیدعە.. جیهادو..هتد. لەگەڵ تێگەشـــتنو راڤەی گەورە زانا ئاینییە سۆفیو ئەشعەرییەکانی ئەو سەردەمەی خۆرهەڵاتی ئیســـلامیدا وێک نەدەهاتەوە. ناکرێت لەم نێوەندەشـــدا فاکتەری سیاسی فەرامۆش بکەین، چونکە وەک سەرچاوە مێژوییەکان ئاماژەی پێ دەکەن، راپۆرتنوسو پیاوەکانـــی دەرباری ســـوڵتانی عوســـمانی، لەنامـــەو راپۆرتەکانیانـــدا، بانگەوازی وەهابییەکانیان بە هەڵگەڕانەوەیەکی سیاســـیو کودەتایەکی ســـەربازیی ناساندوە، لەم رێگایەشـــەوە توانیویانە سیاسەتی سوڵتان بدەن بەگژ وەهابییەکانداو سوڵتان، جگە لەوەی لەشـــکری کردە سەر وەهابییەکان، نوسەرو شاعیرو زانا ئاینییەکانیشی هاندەداو کۆمەکی دەکردن بۆ ئەوەی دژ بەبیرو بۆچونی سەلەفییەکانی نیوە دورگەی عەرەب، بوەستنەوە[٢].

مۆرکـــی یاخیگەرانەی کۆمەڵایەتیو ئاینی بزاڤی وەهابیی، بوبەهۆی ئەوەی بانگەوازی وەهابی لەدەمی خۆیدا، وەک پێویســـت گەشـــەنەکاتو پەل نەهاوێت. لەمبارەیەوە، محەمـــەد قوتب، دەڵێت «بزوتنەوەکە هەر لەلانکەی خۆیدا گیانی ســـپاردو لەنیمچە دورگـــەی عەرەبیدا قەتیس بو»[٣]. بەڵام لایەنگرانی بیـــری وەهابی، باس لەوەدەکەن کە ئەم بیرە لەرۆژهەڵاتەوە گەشتۆتە هیندستانو لەخۆرئاواشەوە گەشتۆتە ئەفەریقا، لەهەمـــو ئەم ناوچانەش قوتابخانەو زاناو لایەنگری رێبازی ســـەلەفیی زۆرن[٤]، ئەمە جگە لەوەی ســـاڵانەو لەکۆبونـــەوە ملیۆنییەکانی وەرزی حەجدا، ســـەدانو هەزاران نامیلکـــەو کتێبو کاســـێتو ســـی دیو رێنمایی بەچەندین زمان لەســـەر نێوەڕۆکو

---

١. محمد قطب: كيف نكتب التأريخ الاسلامي، ل ١٧٦

٢. عبدالعزيز بن محمد عبداللطيف: دعاوى المناوئين لدعوه الشيخ محمد بن عبدالوهاب، ل٢١١

٣. محمد قطب: كيف نكتب التأريخ الاسلامي، ل ١٧٨

٤. مركز بحوث جامعه بن محمد الاسلاميه: بحوث اسبوع الشيخ محمد بن عبدالوهاب، ل٣١٢

رایەڵەکانـــی ئەم بیرە دابەش دەکرێـــتو بڵاودەکرێتەوە. ئەوانەشـــی لەکایەی بیری ئیســـلامیدا شارەزان، جەخت دەکەنەوە، کاریگەری بیری سەلەفیانەی وەهابی لەسەر چەندین بیرمەندی نێوداری وەک جەمالەدینی ئەفغانی[1] و بزاڤەکانی وەک: سەنوســـی لەمەغریب، ئەلمەهدی لەســـودانو چەندین بزوتنەوەو تەوژمیتری ئاینیی، راستییەکی حاشا هەڵنەگرەو بەئاشکرا هەستی پێدەکرێت[2].

نوســـەری گەورەی میسری، تەها حسێن، لەبارەی کاریگەریو رۆڵی بزاڤو بانگەوازی وەهابییەکانـــەوە دەڵێت «ئەگەر تورکو میســـرییەکان بەرهەڵســـتی چەکدارانەی بزوتنەوە ئیســـلاحییەکەی محەمەد عەبدولوەهابیان نەکردایە، هیوای ئەوەی لێدەکرا، شکۆمەندیو ســـەروەری سەدەی دووەمو ســـێیەمی کۆچی بۆ ئیسلامو عەرەبەکان بگێرێتەوە». بەبۆچونی هەندێک لەرۆژهەلاتناســـان، بیـــری وەهابی رۆڵێکی هێجگار گەورەی گێڕاوە لەبەئاگاهێنانەوەی عەرەبو گەلاڵەکردنی بنەماکانی بیری بەرەنگاریو موقاوەمـــەی عەرەبیدا. چونکـــە بزوتنەوەکە، جگـــە لەرەهەنـــدو نێوەرۆکە ئاینیو ســـەلەفییەکەی..بەدیوێکیتردا رەتکردنەوەی دەسەڵاتی خراپو خەلافەتی تورکەکانو هەوڵدان بو بۆ دامەزراندنی دەســـەڵاتێکی ســـەلەفیی عەرەبی، لەپیرۆزترین جێگای ئیســـلامیدا[3]. هەندێک بیرمەندیتری عەرەب، پێیانوایە وەهابییەکان بەخواستی خۆیان بێت یان نا، ناراستەوخۆ رۆڵیان هەبوە لەهوشیارکردنەوەی هەستو هۆشی عەرەبیدا لەبێئاگایـــی، تەنانەت هەندێک لەنوســـەرەکان، بزوتنەوەی وەهابییان لەپێشـــەنگی بەرهەڵستکارانو نەیارانی دەسەڵاتی تورکدا، لەنیشتمانی عەرەبی داناوە. بەڕای ئەم نوسەرانە وەهابییەکان بونەتە هەوێنو پێشینە بۆ گەلاڵەبونی ئایدۆلۆژیایەکی نەتەوەیی عەرەبیی[4]. بەڵام سەلەفییەکان، بەتوندی کارکردن لەسەر دەمارگیریی ناسیۆنالیزمو نەتەوەگەرایی، رەتدەکەنەوەو پێیانوایە ناســـیۆنالیزمو نەتەوەپەرســـتی «گوزارشت لەنەفامیو گەڕانەوە بۆ ســـەردەمی جەهالەت دەکات». لەمبارەیەوە، شـــێخ بن بازی موفتی کۆچکردووی سعودیە، دەڵێت «ئیستیعمار، بەبانگەشەکردن بۆ نەتەوەگەرایی

1. هەمان سەرچاوەی پێشو، ٣١٣

2. موسى بن عبدالله آل عبدالعزيز: اضواء على دعوه محمد بن عبدالوهاب، مجله السلفيه العدد ٢، الرياض ١٤١٧ ه، ل٩٠

3. بڕوانە: لونكريك: أربعه قرون من تأريخ العراق الحديث، ١٧٨

4. د. الياس فرج: تطور الايدولوجيه العربيه الثوريه، ل١٨

عەرەبیی کەیفخۆش‌و شاگەشـــکە دەبێت، چونکە لەرێگای نەتەوەپەرستییەوە عەرەب لەئاینەکەیـــان دور دەخەنـــەوەو بەنەتەوەکانیانەوە ســـەرقاڵیان دەکەن». هەروەها دەڵێت «یەک لەســـەلمێنراوەکانی ئیسلام ئەوەیە: بانگەشـــەکردن بۆ نەتەوەگەرایی عەرەبی‌و نەتەوەکانیتر، بانگەشەیەکی پوچ.. هەڵەیەکی گەورە.. خراپەیەکی ئاشکرا.. نەفامی‌و جەهالەت.. فیڵکردنە لەخەڵکی موســـوڵمان». ناوبراو، بەوە بەڵگە بۆ ئەم حوکمە قورسە، لەســـەر نەتەوایەتی دەهێنێتەوە کە موسوڵمانان پەرتەوازەدەکات.. ناکۆکی دەخاتە نێوانیان‌و هەروەها ئاماژە بەچەندین ئایەت‌و فەرمودە دەکات، لەوانە فەرمودەیەکی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسـلم)، کە سەرزەنشـــت‌و لۆمەی بانگەشـــەکەرانی دەمارگیریـــی بۆ هۆزو خێڵـــەکان دەکات‌و دەربارەیان دەفەرموێـــت «لەئێمە نین». هەروەهـــا لەگێڕانەوەیەکیتردا هاتوە کە پێغەمبەر(صلی الله علیه وسـلم) دەفەرموێت «خوا وەحی بۆکردوم هێندە لەخۆبردوبین کەس فشـــە بەســـەر کەســـیتردا نەکات‌و کەس خۆی بەسەر کەســـیتردا هەڵنەکێشێت»[1]. هیچ بەرهەم‌و گوتارێکی سەلەفییەکانیش شـــانازیکردن بەتەوەگەرایی عەرەبی لەخۆناگرێت‌و بگرە بەشـــێکی زۆری مەشـــخەڵ هەڵگرانی ئەم بیرە لەکۆن‌و نوێدا لەخەڵکانی ناعەرەبن.

---

١. عبدالعزیز عبدالله بن باز: نقد القومیه العربیه، ل ٧ ـ ١٠

# سەرهەڵدانی بانگەوازی وەهابی لەنەجد

ناکرێت باس لەوەهابییەکان بکەینو نەگەڕێینەوە، بۆ گەشتو گەڕانەکانی محەمەد عەبدولوەهاب بەبیابانی عەرەبیدا، کە هۆکاری گەڵاڵەبونی بۆچونە جیاجیاکانی ئەوبون لەمەڕ رەوشی ئاینیو کۆمەڵایەتی جیهانی ئیسلامی. هەڵوێستەکردنی زۆر لەسەر ژیاننامەو پاشخانی فیکریو رۆشنبیری محەمەد عەبدولوەهاب، زیاتر نزیکمان دەکاتەوە لەتێگەشتن، لەنێوەڕۆکی بیری وەهابیو چۆنیەتی ژیانەوەی بیری سەلەفی، چونکە سەرەتاو کۆتایی بیری وەهابی، لەسەر بۆچونو فەتواکانی محەمەد عەبدولوەهاب، بنەڕەتە. هەرچەندە ناوبراو، بەنیازی خوێندنو دەستخستنی زانستی شەرعی بەشارەکانی سعودیەی ئێستاو عێراقدا، دەستی بەگەشتو گەڕانکرد، بەڵام ئەو دیمەنانەی ناوبراو، لەگەڕانەکانیدا، بەرچاوی کەوتن، بیرکردنەوەو تێڕوانینەکانی بەئاراستەیەکدا برد کە (لۆنکریک) ی رۆژهەڵاتناس بە «تەقینەوەی ئاینی» گوزارشتی لێدەکات[1].

محەمەد عەبدولوەهاب، لەسەر هەمان دابو نەریتی سەردەمی خۆی، روی لەشاری مەدینە کردوە کە ئێستاشی لەگەڵدابێت، کاروانسەراو قیبلەنومای خوێندکارە ئاینییەکانی جیهانی ئیسلامییەو گرنگییەکی ناوازەی زۆری هەیە، چونکە شاری پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)و هاوەڵەکانیو پایتەختی سێ خەلیفەی راشیدین بوە[2]. ناوبراو، لەشاری مەدینە رێگای لەشێخ محەمەد حەیات ئەلسندی، کەوتوە کە ئەویش بەهەموجۆرێک دژی بیدعەو داهێنانی عیبادەتو دەمارگیری مەزهەبی بوە[3]. جگە لەکاریگەری بۆچونەکانی ئەم مامۆستایەشی لەسەریی، محەمەد عەبدولوەهاب، لەماوەی ژیانیدا لەمەدینە، لەنزیکەوەو بەچاوی خۆی کۆبونەوەو وابەستەیی زیاد لەسنوری خەڵکی لەدەوری ئارامگای پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) بینیوە، بەجۆرێک خەڵک وەک پردی پەیوەندیی نێوان خۆیانو خودا هاوارو هانایان بۆدەبرد. ئەم پەیوەستبونەش بەگۆڕی پێغەمبەرو پیاوچاکەکانیتر کە کۆڵەکەیەکی بنەڕەتیی

١. أربعه قرون من تأريخ العراق، ل ٢٢٧

٢. ابو مسعود الندوی: الشیخ محمد بن عبدالوهاب، ل١٦

٣. د. ابراهیم خلیل احمد: تأریخ الوطن العربی فی العهد العثمانی، ل ٢٤٥

سۆفیگەرییە، لەگەڵ بۆچونو بیرکردنەوەی ئەودا، نەدەگونجاو بەلایەوە جۆرێکبو لەو جۆرە پەرستشانەی کەبەپێی تێگەشتنی پێشینانی ئیسلام، بیدعەو خورافاتو بگرە هەندێکجار، سەریش دەکێشـــێت بۆ شەریک دانان بۆ خوا، کە بەدترین، سەرپێچییە لەنێو شەریعەتی ئیسلام.

ناوبراو، لەدوای شـــاری مەدینە رویکردۆتە شـــاری بەسرەو لەوێ بەمەزهەبی شیعەی جەعفەری ئاشنابوە[1]*.. ئەوکاتەی ئەم گەنجە چالاکە، لەبەسرەبو هەندێک پەیوەندی لەگەڵ دانیشتوانی بەسرەدا دروستکردو ویستی ئەم شارە بکاتە مەڵبەندی بانگەوازو پێگەی راگەیاندنی بۆچونە ســـەلەفیخوازەکانی، بۆ ئەم مەبەســـتەش چەند نوسینو نامەیەکی لەنێو خەڵکدا بڵاوکردەوە. لەم نامەو نوســـراوانەدا، راشـــکاوانەو بێ پێچو پەنا، دژی گۆڕپەرســـتیو پەنابردن بۆ پیاوچاکان وەستایەوە، بەڵام خەڵکی بەسرە کە زۆرینەیان شـــیعەبون، ئەم تێڕوانیە سەلەفییە سوننییەیان رەتکردەوە.. نەک هەر ئەوە بەڵکە، محەمەد عەبدولوەهابی خاوەنیشیان شاربەدەرکرد[2].

لەپاش ئەم سەرەتا نسکۆبەشەش، ناوبراو، کۆڵی نەداو بۆ بڵاوکردنەوەی بۆچونەکانی روی لەهەرێمـــی نەجـــد* کـــرد. هەر بەگەشتنیشـــی بۆ ئەم هەرێمە، چوە شـــاری حرەیمەلا، کە شوێنی نیشـــتەجێبونی عەبدولوەهابی باوکی بوەو لەوێ دەستیکردە،

---

١. جعفر السبحاني: هەمان سەرچاوەی پێشو، ل ١٤.

* ناوی جەعفەری دەگەڕێتەوە بۆ ئیمام جەعفەری سادقی نەوەی ئیمامی عەلی.

٢. د. أبراهيم خليل أحمد: هەمان سەرچاوەی پێشو، ل ٢٤٦

*نەجـــد، لەزمانی عەرەبیدا بەواتـــای بەرزدێتو بانێکە دەکەوێتە ناوەڕاســـتی نیمچە دورگەی عەرەبیو گەورەترین هەرێمی دورگەی عەرەبیو عەرەبســـتانی سعودیەیە. سنوری ئەم ناوچەیە دەکەوێتە نێوان چیاکانی سروات لەرۆژئاواو دەگاتە بیابانی دەهنا لەرۆژهەڵاتەوە. نەجد، نیشتمانی یەکەمـــی زۆرێک لەهۆزە عەرەبییە گەورەکانەو دیارترین شـــاعیرەکانی ســـەردەمی جاهیلیش خەڵکی ئەم هەرێمەن بەتایبەت شـــاعیری «هەڵواســـراوەکان ـ المعلقات». دەوڵەتی ســـعودیە ســـەرەتا لەنەجدەوە دامەزراوەو پارێزگا گرنگەکانی ریازی پایتەختو قەسیمو ناوچەکانی دۆڵی حەنیفەو چیاکانی شـــەمرو عارزو تویق، دەکەونە ســـنوری ئەم هەرێمەوە. بەگشتی دانیشتوانی نەجد، شارنشینو لەگوندو شـــاردا نیشتەجێنو بەر لەدامەزراندنی دەوڵەتی سعودی لە ١٩٣٢، دانیشتوانی ئەم هەرێمە لەملیۆنێک کەس تێپەڕیان نەدەکرد. بڕوانە وێبسایتی ویکیپیدیا

وتاردانو بانگەوازکردن[1]. سەرچاوەو تۆمارە مێژوییەکان، هێما بۆ ئەوەدەکەن شێوازی بیرکردنـــەوەو فەتوادانی محەمەد عەبدولوەهاب، جیاوازتربوە لەزاناکانی ســـەردەمی خۆی. ئەو، دژی چاوپۆشـــیکردن لەهەڵەی خەڵـــکو خۆدزینەوەبو لەجێبەجێکردنی حوکمەکانی شەریعەت.. پێداگریی لەســـەر ئەوەدەکرد، دەقو حوکمەکانی شەریعەت چۆنن، وەک خۆیان جێبەجێو پەیڕەوبکرێنو هیچ جۆرە سازشێکیان لەسەرنەکرێت[2].. خوازیـــارو بەتەمای ئەوەبو دەقو دەســـەڵات، ئاوێتەبکاتو لەرێـــگای جێبەجێکردنی دەقەکانەوە ســـنورێک بۆ شپرزەییو پاشاگەردانی سەردەمی خۆی دابنێت، بۆ نمونە ســـزای بەردەبارانکـــردن (رجم) ی خەڵکانـــی داوێنپیسو زینـــاکاری زیندوکردەوە، لەکاتێکدا، ســـاڵانێکبو، فەرامۆشکرابو[3]. هەروەها خۆی بەشەرمەزارو خەتابار دەبینی کاتێـــک بەدیارچاوی خەڵکـــەوە، کۆمەڵێک لەنێرینەکانی هەرێمـــی نەجد، پەیوەندی سێکســـییان لەگـــەڵ یەکتردا دامەزراندبـــو. وەک رێبەرێکی ئاینییـــش بەرامبەر بەم قەدەغەشکاندنە شەرعیو کۆمەڵایەتییە، حەماسەتی دەجوڵاو هەستی ئازایەتیو گیانی سزادانو تۆڵەکردنەوەی دەکەوتە جۆشو خرۆش[4]. هەر بەم هۆیەشەوە لەگەڵ خەڵکی شـــاری حرەیملای نشـــینگەی باوکیدا، کەوتە کێشەو ناکۆکییەوەو دانیشتوانی ئەم شارەش گرفتی زۆریان هێنایەرێگای.

ســـەرچاوە مێژوییەکان دەگێڕنـــەوە، کۆمەڵێک کۆیلەی جوتیار، کـــە لەزەوییەکانی حرەیملا، کاریاندەکردو لەکاری نێربازیو سێکســـی ناشـــەرعیی تێوەگلابون، پیلانی هێرشـــکردنە ســـەرماڵی محەمەد عەبدولوەهابیان دانا، چونکە ناوبراو سوربو لەسەر ئەوەی حوکمی شەرعیان بەسەردا جێبەجێ بکات کە کوشتنو بەردەبارانکردنە، بەڵام بەر لەجێبەجێکردنی پیلانی هێرشـــەکە، ناوبراو بەهاوکاریو چاوساغیی دراوسێکانی هەڵهاتو شاری حرەیملای بەجێهێشت[5].

محەمەد عەبدولوەهاب، لەپاش دەرپەڕاندنی لەحرەیملا، لەشاری عوەیەینە گیرسایەوە، کە شوێنی لەدایکبونی خۆیەتی، ئەمجارەیان جیاواز لەبەسرەو حرەیملا، بۆ زامنکردنی

١. تحسين ابراهيم الدوسكي: هەمان سەرچاوەی پێشو، ل ٤٦

٢. سنت جون فيلبى: تأريخ نجد ودعوه الشيخ محمد بن عبدلوهاب (السلفيه)، ل ٣٣

٣. كارل بروكلمان: تأريخ الشعوب الاسلاميه، ل ٥٥٠

٤. سنت جون فيلبى: تأريخ نجد ودعوه الشيخ محمد بن عبدلوهاب (السلفيه)، ل ٣٣

٥. هەمان سەرچاوەی پێشو ل ٣٥

پاراستنی بانگەوازەکەی، هاوپەیمانێتی سیاسیی لەگەڵ عوسمانی کوڕی موعەممەری، میری عویەینەدا، مۆرکردو مژدەی سەرکەوتنو چارەنوسێکی گەشی بەمیر عوسمان دا[١]. وەک دەریش دەکەوێت میری عویەینە، قەناعەتی بەبۆچونە سەلەفییەکانی محەمەد عەبدولوەهاب، کردوەو لەگەڵیدا کەوتۆتە روخاندنی نەزرگاو گومەزیی سەر گۆڕستانەکانو تەنانەت، لەسەر فەتەواو هاندانی محەمەد عەبدولوەهاب، ژنێکی زیناکاریشی بەردباران کرد[٢].

ئەو ماوەیەی محەمەد عەبدولوەهاب، لەشاری عویەینەبو هەنگاوگەلێکی گرنگی هەڵگرتوە، کە دەکرێت وەک سەرەتای جێبەجێکردنی بۆچونو بیرە ئایینییەکانی ئەژماربکرێت. ناوبراو، لەم شارەدا دەستیکردە بڕینی ئەو درەختانەی خەڵک بەپیرۆزی دەزانینو هەر لەم میانەیەشدا مەزاری سەر گۆڕی زەیدی کوڕی خەتابی براگەورەی عومەری کوڕی خەتابی روخاند، کە لەغەزای یەمامەو لەکاتی سەرکردایەتیکردنی سوپای ئیسلامدا گیانی سپاردوە [٣]*. هەروەها نوێژی جەماعەتی لەنێو مزگەوتەکاندا زیندوکردەوەو قەناعەتی بە میری عویەینەکرد باجو سەرانەی سەر خەڵک کەم بکاتەوە[٤].

ئەم لێک نزیکبونەوەو کارە هاوبەشانەی میری عویەینەو محەمەد عەبدولوەهاب، سلێمانی کوڕی عریعەری میری هەرێمی ئیحسای سعودیەی خستە گومانەوە،

---

١. د. أبراهيم خليل احمد: تأريخ الوطن العربي، ل٢٤٥

٢. الندوه العالميه للشباب الاسلامي: الموسوعه الميسره، ل ٢٧٣

٣. عثمان بن بشر النجدي: عنوان مجد في تأريخ نجد، ١/ ٨ ـ٩

* سەلەفییەکان کۆمەڵێک بەڵگە دێیننەوە بۆ روخاندنی گۆڕەکان، لەوانەش ئیمامی موسلیم، ریوایەتیکردوە، عەلی کوڕی ئەبوتالیب بە ئەبی هەیاجی ئەلئەسەدی وتوە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، رایسپاردوم، هەر بتێکم بینی بیشێوێنمو هەر گۆڕێکی بەرزم بینی تەختی بکەم. هەروەها جابری کوڕی عەبدوڵڵا دەڵێت «پێغەمبەر نەهی کردوە گۆڕ گەچکاری بکرێو بینای لەسەر بنیات بنرێتو شتی لەسەر بنوسرێت. هەروەها ئیمامی تورمزیو ئیبن ماجە چەندین فەرمودەیان لەسەر نادروستی بینادروستکردن لەسەر گۆڕ کۆکردۆتەوەو چەندین ساڵ بەر لەوەهابییەکانیش ئیمامی نەوەوی لەئیمام شافیعییەوە دەگێڕێتەوە «ئیمامەکانم بینی لەمەککە فەرمانیان بەروخاندنی بینای سەر گۆڕی پیاوچاکەکان دەکرد».

٤. هەمان سەرچاوەی پێشو، ١/ ٩ ـ ١٠

خەڵکانێکیش وەها سـلێمانیان حاڵیکرد کە محەمـەد عەبدولوەهاب، چاوی بڕیوەتە پۆستی میرایەتیو بەتەمایە هەرێمەکەو دەسەڵاتەکانی لێ زەوت بکات[1]، ئەویش، هیچ بەبەرییەوە نەوەستاو یەکڕاست هەڕەشەی کردەسەر میر عوسمانی کوڕی موعەممەرو داوایکرد، «هەرچـی زوترە محەمەد عەبدولوەهاب، لەشـارەکەی دەربکات». میری عویەینەشـە، شەڕی میری گەورەی ئیحسـای پێنەدەکرا، بۆیە بەرێگایەکی هێمنانە محەمـەد عەبدولوەهابی جوابکردو پێی وت «میر سـلێمان، فرمانیکردوە، بتکوژین، ئێمەش توانای بەرەنگاربونەوەی رقو توڕەیـی ئەومان نییەو ئازایەتیو جوامێرییش نییە لەماڵـی خۆماندا بتکوژین، بۆیە رو لەهەرکوێ دەکەیت، خۆت سەرپشـک بەو وڵاتی ئێمە بەجـێ بهێڵە»[2]. میری عویەینە، بەم ملکەچکردنەی بۆ میری ئیحسـا، ریسەکانی محەمەد عەبدولوەهابی خاوکردەوەو کاروانی بزوتنەوەی وەهابیی گێڕایەوە بۆ چوارگۆشەی یەکەمو سەرەتای قۆناغو محەمەد عەبدولوەهابی ئاوارەو پەڕاگەندەی نێـو نیوەدورگەی عەرەب کرد. بـەڵام ئەو، دوای ئەمەش هـەر نوچی نەداو کەوتە سۆراغکردنی پەناگەو لانکەیەکیتر بۆ ئەوەی تێیدا بگیرسێتەوە، تا ئەوکاتەی محەمەدی کوڕی سعودی* دۆزییەوە، ئیتر دەرگای خێرو خۆشیی لێکرایەوەو لەکەسێکی قاچاغو راوەدونراوەوە بوە موفتیو رێبەری ئیمارەت.

---

١. هەمان سەرچاوەی پێشو ١/١٠ - ١١

٢. هەمان سەرچاوەی پێشو ١/ ١١

* محەمەدی کوڕی سعودی کوڕی مقرن، ساڵی ١٧٦٥، زاینی کۆچی دواییکردوەو دامەزرێنەری دەوڵەتی سـعودیەی یەکەمو کوڕی باپیرە گەورەی بنەماڵەی سـعودی فرمانڕەوای ئێسـتای سـعودیەیە. دەسەڵاتی محەمەد سعود یەکەمجار لەدرعیەوە دەستیپێکردوەو دواتر گوازراوەتەوە بۆ ریازی پایتەختی ئێسـتای سعودیە. ئال سعود، یەکێکن لەبنەماڵە کۆنو ناودارەکانی نیمچە دورگەی عەرەب. بۆ زیاتر بڕوانە وێب سایتی گەڕانی ویکیپیدیاو وێب سایتی «بوابە المملکە». www.ksa_3.com

# هاوپەیمانێتی سەلەفییەکانو ئال سعود

ئەگەرچی دەرکردنی محەمەد عەبدولوەهاب، لەشاری عویەینە، گورزوەشاندنێکی سەخت بو، لەبزوتنەوەی وەهابی لەساتەوەختێکی ناسکو بەراییدا، بەڵام لەلایەکیترەوە، دەروازەی قۆناغێکی نوێی لەم بزوتنەوەیە کردەوە. بێهیواکردنی محەمەد عەبدولوەهاب، لەلایەن عوسمانی کوڕی معەمەری میری عویەینە، کۆتایی پەراگەندەییو خەموژانی محەمەد عەبدولوەهابە لەمێژودا. ناوبراو، دوای ئەوەی بەدڵشکاوی، شوێنی لەدایکبونی خۆی بەجێهێشت، بەخۆیو تەنها باوەشێنێکەوەو بەتولە ڕێیەکی بیابانیدا روی لەمیرنشینی درعیە کرد کە لەلایەن محەمەی کوڕی سعودەوە بەڕێوەدەبرا. هەر کە گەشتە ئەم میرنشینە لەدەمەو ئێوارەیەکی ساڵی ١٧٧٤زاینی، لەماڵی یەکێک لەخوێندکارو دۆستەکانی بەناوی محەمەد سوەیلم ئەلعرینی، گیرسایەوە کە لەپەڕی شارەوەبو. لەم ماڵەشەوە، دیسان دەستی بەیەکەم هەنگاوی کاروانە درودرێژە پڕ مەترسییەکەی کردەوە[1].

محەمەد عەبدولوەهاب، لەماڵی ئەم خوێندکارەیدا، توانی کاریگەری لەسەر دوو برای میری درعیە دروستبکات، لەمانەش گرنگتر توانیی، کاربکاتە سەر، موزیی کچی ئەبی وەتبان، کە ژنی محەمەد سعودی میری درعیەبوەو لەمێژوی سعودیەدا، بەژنێکی خاوەن تەگبیر باسدەکرێت. زۆرێک لەسەرچاوەکان باس لەوەدەکەن موزی، بەمحەمەد سعودی مێردی وتوە «ئەم محەمەد عەبدولوەهابە، خەڵاتی خوایە بۆیناردویت، تۆش سودی لێ وەرگرە»، بەهۆی ئەم ژنەو دوو براکەی میرەوە، محەمەد سعودو محەمەد عەبدولوەهاب، لێک نزیکبونەتەوەو[2]، یەکەم هاوپەیمانێتی ستراتیژییان لەگەڵ یەکترا ئیمزاکردوە کە وەک یەکێک لەگرنگترینو بەناوبانگترین هاوپەیمانێتییەکانی نێوان دینو دەوڵەت لەمێژوی نوێو ناوچەکەدا ئاماژەی بۆدەکرێت. ئەم هاوپەیمانێتییە لەئەدەبیاتی رەسمیی دەسەڵاتدارانی سعودیەدا بە«گەڵاڵەنامەی درعیە»ناوزەد دەکرێت. بە یەکەم بەردی بناغەی دامەزراندنی «دەوڵەتی سعودیەی یەکەم» لەقەڵەمدەدرێت.

---

١. سنت جون فیلبی: تأریخ نجد......، ل ٣٨

٢. السید محسن الامین: کشف الارتیاب، ل ١٤

بەپێی گێڕانەوەی دەزگا فەرمییەکانی ســـعودیە، محەمەد بن سعود، لەسەر خواستو داوای دوو براکەی کە بوبونە هەواداری محەمەد عەبدولوەهابو پێشتریش ئامۆژکاریی موزیی هاوسەری، بەخودی خۆی چوە پێشوازیکردنی شێخی میوان، لەماڵی محەمەد ئەلعرینیو ئەم هەنگاوەش میوانە نوێیەکەی میرنشینەکەی لەچاوی خەڵکی درعیەدا ســـەنگینو قورسکردوە. لەم دیدارەدا کە ســـاڵی ١٧٧٤ زاینیدا بەڕێوەچوە، هەردولا رێککەوتن لەســـەر دابەشکردنی دەسەڵاتە رۆحیو سیاســـییەکانی میرنشینایەتییەکە بەجۆرێک، دەســـەڵاتی سیاسیو ئیداری بەدەست محەمەد ســـعودو لەدوای خۆیشی نەوەکانییەوەبێت.. لەبەرامبەریشـــدا، محەمەد عەبدولوەهاب، ببێتە موفتیو رێبەری ئاینی ئیمارەتەکە[1].

بەپێی گێڕانەوە فەرمییەکانی عەرەبستانی سعودی، دوای بەئاکام گەشتنی دانوستانی رێکەوتنەکە، محەمەد بن سعود، دەستی لەناودەستی محەمەد عەبدولوەهاب، داناوەو بەیعەتی پێداوە لەســـەر «سەرخســـتنی دینی خـــوداو پێغەمبەر(صلى الله عليه وســـلم )، جیهادکردن لەرێگای خوا، پەیڕەوکردنو جێبەجێکردنی شـــەریعەت، فرمان بەچاکەو نەهی لەخراپە».

هەر کە محەمەد ســـعود، چوەژێر چەتری بیری ســـەلەفی، کوڕێکیشـــی کردە زاوای محەمـــەد عەبدولوەهابو بەمەش جگە لەبەرژەوەندییەکانیتـــر، پەیوەندی خزمایەتی کەوتە نێوانیانەوە. دوای ئەمەش، بەهەموجۆرێک کەوتەکارکردن بۆ گشـــتاندنی بیرە ئاینییە نوێیەکە بەســـەر رەعیەتەکانیدا[2]. ســـلێمانی برای محەمەد عەبدولوەهاب، کە نەیاری بیری سەلەفییە، ئاماژە بەوەدەکات، محەمەد سعود، بەگوشارو هێز، دەوروبەری خۆی ناچارکردوە بچنەســـەر بیری ســـەلەفیانەی براکەی[3]. بـــەڵام گێڕانەوە فەرمیو دەوڵەتییەکانی ســـعودیە، جەختدەکەنەوە بیرەکە لەرێـــگای بانگەوازو رونکردنەوەو ئامۆژگارییەوە بڵاوبۆتەوە. گومانیش لەوەدانییە پشـــتگیریکردنو پەسەندکردنی بیری ســـەلەفی لەلایەن فرمانڕەوای درعیەوە، کاریگـــەری خۆی هەبوە، چونکە وەک لەدێر زەمانەوە عەرەب، وتویانە «خەڵک لەسەر ئاینی پادشاو سەرپەرشتەکەیان دەبن». لەتێکڕای ســـەرچاوەکاندا بەئاشـــکرا دیارە بەدوای هاوپەیمانێتیە ســـتراتیژییەکەی،

---

١. الندوه العالميه للشباب الاسلامي: الموسوعه الميسره.... ل ٢٧٤

٢سليمان بن عبدالوهاب: الصواعق الالهيه في الرد على الوهابيه، لجنه من المحققين، ل٥

٣. لونكريك: أربعه قرون من تأريخ العراق، ل ٢٢٧

محەمەد عەبدولوەهابو ئال سـعوددا، چەندین ناوچەیتـری نیمچە دورگەی عەرەبی چونەتە سەر قەڵەمڕەوی ئیمارەتی درعیە. لەپاش دڵنیابون لەپشتیوانیی ئال سعودو دابینکردنی هەمو کۆمەکێک بۆ بانگەوازەکەی، محەمەد عەبدولوەهاب، یەکلابویەوە بۆ کۆڕگرتنو وتاردانو نامە ناردن بۆ میرنشینەکانی دەوروبەرو پەیوەندیکردن بەسەرۆک هۆزەکانـی ناوچەکە.. خەڵکێکـی زۆریش بەپیر بانگـەوازو پەیامەکانییەوە چونو ئیمارەتی درعیە، بوبە کاروانسـەراو مەکۆی کۆبونەوەی هەوادارانی بیری سـەلەفیو خوێندکارێکـی زۆری ئاینی لەهەر چوارلای نیوە دورگەی عەرەبەوە رویان تێدەکرد[1]، بەجۆرێـک تۆمارە رەسـمییەکانی دەوڵەتی سـعودی باس لەوەدەکـەن، لەوکاتەدا میرنشینەکە توانای لەخۆگرتنو راییکردنی ئەو هەمو خوێندکارەی نەبوە.

لەسـەرەتای دەسـتبەکاربونیدا وەک رێبەری رۆحیی میرنشـینی درعیە، ناوەڕۆکو رێبازی وتارەکانی محەمەد عەبدولوەهاب، زیاتر جەختیان لەپاکژکردنەوەی بیروباوەڕو پەرسـتش کردۆتـەوە. لەتێکڕای ماوەی کارکردنیشـیاندا لەدرعیە، هیچ سـاردیو ناجۆرییـەک لەنێوان محەمەد عەبدولوەهابی موفتیو محەمەد سـعودی فرمانڕەوادا، تۆمارنەکراوە. بگرە بەوپەڕی هاوکاریو لێککەشـتنەوە ئیدارەی کاروباری میرنشینی درعیەیان کردوەو مێژونوسـان دەگێڕنەوە: محەمەد سـعود، هیـچ پرۆژەو بڕیارێکی بەبـێ رەزامەندیو پرسوڕای محەمەد عەبدولوەهاب، گەڵاڵەو جێبەجێ نەکردوەو هیچ لایەکیشیان هەنگاوی سەربەخۆیان بەبێ ئەویتر هەڵنەگرتوە[2].

پاش ئەوەی محەمەد سـعود کۆچـی دواییکرد، میر عەبدولعەزیـزی کوڕی جێگای گرتـەوە*، کە زاوای محەمەد عەبدولوەهاب، بـوە[3]. عەبدولعەزیز، بەهەمان نەفەسو حەماسـەتی باوکیو بگرە زیاتریش، درێژەی داوە بەپشتیوانیکردنی بیری سەلەفیو سەرخسـتنی خەزورەکەی لەسـەردەمی حوکمڕانی ئەمیشدا، محەمەد عەبدولوەهاب، لەتەمەنی ٩٢ ساڵیداو لە١٧٩٢زاینی، کۆچی دوایی کردوە.

عەبدولعەزیز، بەوپێیەی رابەری ئاینیو سیاسی دەوڵەتەکەبوە، لەسەر دابو دەستوری باوکی نازناوی «ئیمـام»ی هەڵگرتوە. هەروەها لەپێنـاو فراوانکردنی قەڵەمڕەویی میرنشینەکەیو گەیاندنی بیری سەلەفی بەناوچەکانیتر، چەندین لەشکرکێشیو هێرشی

---

١. سنت جون فیلبي: تأريخ نجد، ل ٤٠

٢. عثمان بن بشر النجدی: عنوان مجد... ١٣/١

٣. بڕوانە: وێب سایتی دەوڵەتی سعودی، «بوابە المملکە» http://www.ksa-3.com/

کردۆتە ســـەر دەوروبەری درعیە، لەهەمو ئەو هێرشانەش بەناوبانگتر پەلاماردانەکەی شـــاری کەربەلایە لە ١٨٠٢ زاینی. ساڵێکیش دوای گرتنی کەربەلا، کابرایەکی شیعە مەزهەبی خەڵکی موســـڵ کە هەندێک سەرچاوە دەڵێن کوردبوە، لەتۆڵەی هێرشەکەو روخاندنی مەزاری سەر ئارامگای ئیمام حسێندا، کاتێک میر عەبدولعەزیز، لەمزگەوتی تەریفی درعیە، سەرقاڵی نوێژکردن بوە، لەدواوە تیرۆریکردوە. بەم پێیە، ناوبراو، پاش ٣٨ ساڵ حوکمڕانییو پاش ١٥ ساڵ لەمردنی محەمەد عەبدولوەهابی خەزورو رێبەری ئاینیی میرنشـــینەکەی، ئیمارەتێکی بەرفراوانو بەهێزی بۆ نەوەکانی بەجێهێشـــتوە کە لەمێژودا بە دەوڵەتی یەکەمی ســـعودیە، بەناوبانگەو دواتر نەوەو کەسوکارەکەی فراوانتریان کردوە[1].

لەدوای مردنی محەمەد عەبدولوەهاب، چوار کوڕی ناوبراو بەناوەکانی حسێن، عەبدوڵڵا، عەلـــی، ئیبراهیم، بەهەمان رێگای باوکیاندا رۆشـــتونو لەگەڵ میرەکانی دواتری ئال سعوددا، دەسەڵاتی دینو دنیایان لەنێوان خۆیان دابەشکردوە[2]. دوای مردنی محەمەد عەبدولوەهاب، راســـتەوخۆ، حســـێنی کوڕی جێگای گرتۆتەوەو بوە بەشێخو قازیی میرنشـــینی درعیەو لەدوای مردنیشی براکانیتری کاروباری بانگەوازکردنو رێبەرایەتی ئاینییان لەئیمارەتەکە گرتۆتە ئەســـتۆ. بەردەوامیی هاوکاری ئال ســـعودو نەوەکانی محەمـــەد عەبدولوەهاب، بۆتە هۆی ئەوەی ســـنوری ئیمارەتی درعیە فراوانتر ببێتو بەهاوکاریی هەمویانو لەرێگای هێرشو لەشکرکێشییەوە، شارەکانی مەککە، مەدینە، تایفـو....هتد، یان خســـتە سەرســـنوری قەڵەمڕەوی ئیمارەتەکـــە. بەمەش خەونی دامەزراندنـــی مەزنە دەوڵەتێکی عەرەبی ئیســـلامییان بەدیهێنا کە شـــاری مەککەو مەدینەی لانکەی ئیسلامو ئارامگای پێغەمبەرو شوێنەواری هەنگاو بەهەنگاوی کاروانی بانگی ئیسلامییشیان لەگەڵدابو[3].

لوتکـــەی ســـەروەرییو دەســـکەوتەکانی هاوپەیمانێتـــی نێوان بنەماڵـــەی محەمەد عەبدولوەهابو ئال ســـعودی فرمانڕەوا، لەسەردەمی میر عەبدولعەزیز عەبدولڕەحمان فەیســـەل ئال ســـعوددا تۆمارکراوە کە توانیویەتی «شانشـــینی عەرەبی سعودیە» دابمەزرێنێـــتو ئەمپەڕو پەوپەڕی ناوچەکانی نیوە دورگـــەی عەرەبی لەچێوەی ئەم

---

١. هەمان سەرچاوەی پێشو. هەروەها بڕوانە: عثمان بن بشر: عنوان مجد فی تأریخ نجد، ١٢٤/١

٢. د. عبدالكريم رافق: المشرق العربی، ل ٢٤٨ - ٢٤٩

٣. هەمان سەرچاوەی پێشو، ل ٢٤٨

دەوڵەتە نوێیەدا یەکبخات کە بەدەوڵەتی سـعودیەی سـێیەم «شانشینی عەرەبیی سعودیی» دەناسرێت.

عەبدولعەزیز ئال سعود، سـاڵی ١٩٣٢زاینی، لەیەکخستنی پارچەو بەشە پەرتەوازەو جیاجیاکانی سـعودیە بویەوەو سەرجەم میرنشینو خێڵە جیاجیاکانی نیمچە دورگەی عەرەبی لەژێر ناوی «شانشینی عەرەبیی سعودیە»دا رێکخستو دەوڵەتەکەی بەناوی باپیـرە گەورەیەوە ناونا. هەر لەم ساڵەشـدا بەیەکجاریی بنەماڵەی هاشـمییەکانو بنەماڵەی شـەریفەکانو ئال رەشیدو ئالە میرەکانیتری لەسعودیە یان دەرپەڕاند، یان کپکردەوە.. رۆژی ١٩٣٢/٩/٢٢، بەهـاوکاری ئینگلیزەکان، خۆی کردە، فرمانڕەوای یەکەمو بێ رکەبەری سـعودیەو فەرمانی یەکگرتنەوەی وڵاتی راگەیاندو ریازی گەورە شاری هەرێمی نەجدیشی کردە پایتەختی دەوڵەتەکەی[1].

پاش ئەوەی شـا عەبدولعەزیزی دامەزرێنەر، دانپێدانانـی کۆمەڵگای نێو دەوڵەتیی ئەوسـەردەمی بۆ (شانشینی عەرەبیی سعودیە) مسۆگەرکرد، بیری کردەوە، کۆتایی بەلەشکرکێشـیو جەنـگ بهێنێتو ئەو کادرو جەنگاوەرە سەلەفیانەشـی تائێسـتا لەپێناو یەکخستنی وڵاتو بڵاوکردنەوەی بیری سەلەفی جەنگاون، بۆ بەرقەرارکردنی ئاسـایشو هێورکردنەوەی ناوخۆ ئاراسـتەبکات. هەر لەم میانەیەشـداو لەسـاڵانی سـییەکاندا فەرمانیکرد دەزگای «الامر بالمعروف والنهی عـن المنكر»، دابمەزرێت کە ئێسـتا لەناوەندە رۆژئاواییو دەرەکییەکانی سـعودیەدا بە «باچاوەشی ئاینی» دەناسـرێت. یەکەم سـەرۆکی ئەم دەزگایە، کەئێستا سـەر بەبەڕێوەبەرێتی گشتی هێزەکانی ئاسایشـی ناوخۆیە، شـێخ عەبدولعەزیز عەبدوللەتیفی کوڕەزای محەمەد عەبدولوەهاب، بوە.

«باچاوەشی ئاینی» کە تەنها لەسعودیەدا هەیەو لەناوچەکەو جیهان دامەزراوەیەکی دانسـقەیە، دەزگایەکـی گرنگی ئاینـیو ئەمنیی ئـەم وڵاتەیەو پـڕە لەهەڵگرانو داکۆکیکارانـی بیری سـەلەفیو تائێسـتا ئامارێکـی بڕواپێکراو لەبـارەی ژمارەی کارمەندەکانی لەبەردەسـتدانییە[2]. راپۆرتێکی فەرمیی ئەم دەزگایە باس لەوەدەکات،

١ـ محمد عتریس: معجم بلدان العالم، ل ١٣٢

٢ـ سـیدی احمد بن احمد سـالم، لەوتارێکدا کە بەناوی التیار السـلفی السـعودی، لەبەشی مەعریفـەی (ئەلجەزیرە نێت ـ ٢٠٠٣) دا بڵاویکردۆتەوە، بـاس لەوەدەکات دەزگاکە ٣٠٠ هەزار کارمەندی هەیەو بەسـەر ١٠ هەزار بنکەدا دابەشکراون، بەڵام ئامارە نیمچە فەرمییەکان جەخت دەکەنەوە کە ژمارەیان کەمتر لە ١٠ هەزار کارمەندە.

تەنها لە ســـاڵی ٢٠٠٩ دا، روبەڕوی ٤٠٠ هەزار دۆســـییەو کێشەی ئاینیو کۆمەڵایەتی بونەتـــەوەو ٧ ملیۆن چالاکیی جۆراوجۆری بانگخوازیی ئیســـلامییان لەشـــارەکانی ســـعودیە بەئەنجام گەیاندوە. ســـەرەکیترین کاری دەزگای «الامر بالمعروف والنهی عـــن المنکر» جێبەجێکردنی دەقاودەقی رێبازی ســـەلەفیو رێنماییەکانی بانگەوازی وەهابییە لەعەرەبستانی ســـعودی. کارمەندەکانی ئەم دەزگایە، بەهەموجۆرێک رێگا لەو دیاردانە دەگرن کە پێیان وایە شـــیرکو بیدعەو خراپەن بۆ ئیسلام. لەکارنامەی فەرمیی ئەم دەزگایەدا، کاری ئـــەم دامەزراوەیە بە «قەدەغەکردنی بێڕێزی بەرانبەر ئیســـلام، قەدەغەکردنی فرۆشتنو مامەڵەکردن بەسەرچاوەو نوسراوو کاسێتو فیلمی نەگونجاو لەگەڵ شـــەریعەت، قەدەغەکردنی بیدعە وەک: بەرزڕاگرتنی هەندێک کاتو شـــوێن کە لەسوننەتدا نەهاتونو یادکردنەوەی بۆنە نائیسلامیو داهێنراوەکان، کاری سیحرو جادوگەریی، پاراســـتنی ئاکارو ئەخلاقی ئیسلامیانەو.....هتد». دیاریکراوە. «باچاوەشـــی ئاینی» رێگا لەتێکەڵاوبونی پیاوانو ژنان دەگرێت.. کڕینو فرۆشـــتن لەکاتی نوێـــژی جەماعەتدا رادەگرێت. بۆ راپەڕاندنی کارەکانیشـــیان، کارمەندەکانی لەبەردەم بینای دامەزراوە گشتییەکانو لەنێو بازاڕەکاندا ئێشک دەگرن. لەراپۆرتێکی ســـاڵی ٢٠٠٨ ی کۆمەڵـــەی نیشـــتمانی مافـــی مرۆڤی ســـعودیدا، رەخنـــەی ئەوە لەدەسەڵاتەکانی ئەم دەزگایە گیراوە کە «دەسەڵاتەگەلێکی دیاری نەکراوو بەرفراوانو وردنەکراونەتەوە».

«باچاوەشـــی ئاینـــی» یەکێکـــە لەکۆمەڵێـــک دەزگای ئاینـــیو دادگەرییتری وەک (دەســـتەی گەورە زانایـــان)، (وەزارەتی ئەوقاف)، (وەزارەتـــی داد)، زانکۆو کۆڕو کۆمەڵە شـــەرعیو ئاینییەکان، رێکخراوە کۆمەڵایەتیو خێرخوازەکانی ســـعودیە، کە لەلایەن زانایانو کادرانی ســـەر بەتەوژمو رێبازی سەلەفییەوە بەڕێوەدەبرێن. هەر بەم هۆیەشـــەوە بەشێوەیەکی نیمچە بەردەوام شـــیعەکانی رۆژهەڵاتی سعودیەو نوخبەی عەلمانیو رۆژئاواخوازی سعودی لەتاراوگەوە، لێی دەخوێننو داوای راگرتنی کارەکانیو هەندێکجاریش هەڵوەشاندنەوەی دەزگاکە دەکەن.

لەسەر نەرێتی باوباپیرانی شانشینەکەش، تاهەنوکە موفتی سعودیەو وەزیری ئەوقافی ســـعودیە، کە دو کەسایەتی ئاینین، لەنەوەو بنەماڵەی محەمەد عەبدولوەهابن. بەڵام سیستمی سیاســـی ئەم وڵاتە پادشـــایەتیو حوکمڕانی، تەنیاو تەنیا، لەدەستی ئال سعوددا قەتیس دەکاتو بەپێی ماددەی پێنجەمی دەستوری سعودیە کە بە«یاسای بنەڕەتی» دەناســـرێت، بەمەرج گیراوە، بەهەمیشـــەیی پادشای سعودیە لەباشترینو

راســـاڵترین کوڕانو نەوەکانی عەبدولعەزیز ئال سعودی دامەزرێنەرو یەکخەری وڵات، دەستنیشـــان بکرێن. لەهەمان کاتو لەدەســـپێکی ئەم دەســـتورەدا کە ساڵی ١٩٩٢ زاینی، بەمەرســـومی شـــاهانەی مەلیک فەهد عەبدولعەزیز ئال سعود، چەسپێنراوە، دەڵێت «ئەو بانگەوازە ئیسلاحییەی لەسعودیەدا سەریهەڵداوە ـ مەبەست بزوتنەوەی وەهابیـــی ســـەلەفییە ـ پایەی حوکمڕانـــی وڵات دەنوێنێتو لەســـەر: پەیڕەوکردنی شـــەریعەتی ئیسلام، فرمان بەچاکەو نەهی لەخراپە، جێبەجێکردنی ئەحکامی شەرع، چاککردنـــی عەقیدەو پاکژکردنەوەی لەبیدعە بنیاتنـــراوە. ئەمەش لەو بەهاو بنەما ئیسلامییە دروستانەوە وەرگیراون کە لەسەرەتای ئیسلامدا باوو بڵاوبون».

بەڵام پاش بـــەدوای یەکداهاتنی جەنگەکانی کەنداوو ســـەرهەڵدانی دیاردەی تیرۆرو باڵادەســـتبونی بەها رۆژئاواییەکان بەسەرجیهانەوە، بەشـــێوەیەکی گشتیو بەرچاو هەستدەکرێت، رۆژ لەدوای رۆژ، رۆڵی تەوژمی سەلەفی لەسعودیەدا لەبەشدارو شەریکی حوکمەوە، دەگۆڕێت بۆ پاشکۆی دەوڵەتو بنەماڵەی ئال سعود. بەشێوەیەکی نیمچە بەردەوامو رۆژانەش، لەلایەن خەڵکە عەلمانیو لیبراڵەکانی سعودیەوە کێشەو لەمپەر بۆ ئەم بیرە موحافیزکار ئاینییە دروست دەکرێت. بەپێچەوانەی دەوڵەتی سعودیەی یەکەمەوە، لەئێستادا تەنها میرەکانی ئال سعود، خاوەن پایە سیاسیو ئابورییەکانی سعودیەو بڕیار بەدەســـتی یەکەمی وڵاتو بکوژو ببڕی هەموشتێکن. هەندێک لەمیرو شـــازادەکانی ئـــەم بنەماڵەیەش کـــە ژمارەیان زیاتر لە٧ هەزار میرو کاربەدەســـتە، بەپێچەوانەوەی بیری سەلەفییەوە کاردەکەنو لەئەوروپاو ئەمەریکاوە، پارەی بێشومار تەخشانو پەخشان دەکەنو کەناڵو دامودەزگای خراپ بەڕێوەدەبەن. هەروەها بەشێک لەم میرانەش زیاتر بەلای نزیکبونەوە لەکلتورو گۆڕانەکانی رۆژئاوادا دەچنو بەشێکی کەمیان کە میر نایف عەبدولعەزیزی جێگری ســـەرۆک وەزیرانی سعودی، رێبەریانە، لەســـەر پەیوەستبون بە بیری ســـەلەفەوە پێداگریی دەکەن. لەناوخۆی سعودیەشدا کاریگەریو رۆڵی زانا ئاینییەکانی هەڵگری بیری ســـەلەفی هیچ لەئاســـت سەردەمە پێشـــوەکاندا نییەو بەتایبـــەت دوای روداوەکانی ١١ ئەیلولی ٢٠٠١، لەژێر گوشـــاری ئەمەریکاو خۆرئاوادا، خراوەنەتە ژێر چاودێریو جگە لە بوارە فیقهیو عەقیدەییەکان، بوارێکی ئەوتۆیان پێنادرێت قسە لەکایە سیاسییە زۆر هەستیارەکاندا بکەن.

# هەڵوێستی ئینگلیزو عوسمانییەکان لەبیری وەهابی

بزوتنەوەی وەهابی لەجێگایەکدا سەریهەڵدا کە مەکۆی تەماعو چاوتێبڕینی هەریەک لەتورکە عوسمانییەکانو هێزی ئیستیعماری بەریتانی بو، ئەویش نیوە دورگەی عەرەبییە.

عوسمانییەکان کە بەناو حوکمڕانی نیوە دورگەی عەرەب بون، خۆیان بەسوڵتانو خەلیفەی کۆی جیهانی ئیسلام لەقەڵەمدەداو گومان لەوەدانییە لەهەموکەس زیاتر بەسەرهەڵدانی بزوتنەوەی وەهابی قەڵسو بێزاربون. بەتایبەت کە تێکڕای گوتاری سەلەفیانەی وەهابییەکان، لەگەڵ تانوپۆی ئایدۆلۆژیای سۆفیگەریی عوسمانییەکاندا، دژ دەوەستایەوە.

هەرچەندە، تائێستا هیچ هەڵوێستێکی دژی عوسمانی لەمحەمەد عەبدولوەهابەوە تۆمارنەکراوەو نەگەشتۆتە دەست لێکۆڵەرانو مێژونوسانو لەماوەی ژیانی خۆیدا چوار سوڵتانی عوسمانی بەبێدەنگیی بەڕێکردوە[1]، بەڵام لەراستیدا جموجوڵو بیروڕاکانی هەڕەشەیەکی جددیو گەورەبون لەسەر نفوزو دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی[2]. بەو پێیەشی سوڵتانی عوسمانی خۆی بەخەلیفەی ئیسلامو پارێزەری یەکدەنگیی جیهانی ئیسلام زانیوە، بەهێزترین والی خۆی: محەمەد عەلی، والی میسری راسپاردوە، هەرای وەهابییەکان دابمرکێنێتەوە. بەڵام لەم هەوڵەدا، سەرکەوتو نەبونو ناچار عوسمانییەکانو والییە بەهێزەکەشیان لەمیسر قڕوقپیان لەبزوتنەوەی وەهابیی کردوە.

هەرچی بەریتانییەکانیشە یەکەمجار لەهیندستانەوە هەستیان بەمەترسیی وەهابییەکان کرد، چونکە بانگخوازێکی وەهابیی بەناوی «ئەحمەد بن عیرفان» کەوتە سەنگەرگرتن لەقادیانییەکانی دۆستی ئینگلیزو چەند بزوتنەوەو جموجوڵێکی ئیسلامی دژە ئینگلیزی سەریانهەڵدا کە بزوتنەوەی وەهابییان بەرێنماو مامۆستاو سەردەستەی

١. تحسن ابراهيم الدوسكى: مژكرات الجاسوس الانكليزى همفر فى الميزان، ل ٤٨ ـ ٤٩

٢. محمد قطب: كيف نكتب التأريخ الاسلامى، ل ١٨٣

خۆیان دەزانی[1]. ئەمە جگە لەوەی بڵاوبونەوەی ســـەلەفی لەنێو هۆزە عەرەبییەکانی نیوە دورگەی عەرەبو ســـەر کەنداوی فارسدا، هەستی ئاینی تێدا ژیاندنەوەو بەپشت بەستنو کۆمەک وەرگرتن لەسوپای نەجدی وەهابی، کەوتنە هێرشکردنە سەر قافڵەو کاروانە بازرگانییەکانی «کافرو مولحیدە» ئینگلیزیو ئەوروپییەکان[2].

بۆ بەرگرتن لەم مەترســـییەش ئینگلیزەکان ئەفســـەرێکی پایەبەرزی خۆیان بەناوی ســـادلیر، ناردە ناوچەکەو لەساڵی ١٨١٩ دا، ســـادلیر گەشتە ئیبراهیم پاشای کوڕی محەمەد عەلی والی میسرو دەستخۆشی بەرەنگاربونەوەی وەهابییەکانی لێکرد[3].

جێـــگای خۆیەتی لێردەا، ئاماژە بەیاداشـــتنامەیەک بکرێت کە بەنـــاوی (همفەر)ی «ســـیخوڕی بەریتانییـــەوە» بڵاوکراوەتەوەو تێیدا باس لـــەوە دەکات، «بانگەوازی وەهابیی دەستنێژو دەستکردی ئینگلیزەو دژ بەعوسمانییەکان دروستکراوە». نوسەری نادیارو بێناونیشانی ئەم یاداشتنامەیە گەلێک تۆمەتیتری جۆراوجۆری لەچەشنی مەی خواردنەوە، نوێژ نەکردن، درۆکردن، ســـیغەکردنی ژنو.....هتدی ئاراستەی محەمەد عەبدولوەهابی نوێکەرەوە ســـەلەفییەت، کردوەو بەســـیفەتی ســـیخوڕێکی بەریتانی بانگەشـــەی سەرۆکاریکردنو ئاراستەکردنی بزاڤی وەهابیی دەکات. ئەم یاداشتانە کە تائێســـتا ناوی تەواوی نوسەرو دەزگای چاپکردنی ســـاغ نەبۆتەوە، لەلایەن چەندین ناوەندو نوسەری ســـەلەفییەوە بەتوندی رەتکراوەتەوە. مامۆستایەکی زانکۆی (دان فیداڵ) ی شـــاری لۆس ئەنجلســـی ئەمەریکا، بەناوی عەبدوڵڵا ئیبراهیم ئەلعەسکەر، لەوتارێکـــدا کـــە مانگی حوزەیرانـــی ســـاڵی ٢٠٠١ لەرۆژنامەی (الریاض) ســـعودی بڵاویکردۆتەوە جەخت دەکاتەوە، دوای گەڕانێکی زۆر لەئەرشـــیفی بەریتانیو لەگەورە کتێبخانەکانی رۆژئاوا، بەدوای ناوو ناونیشانی (همفەر) دا سەری لەهیچەوە دەرچوەو تەحەدای ئەوانەش دەکات، «یاداشـــتەکانی همفەر»، بڵاودەکەنەوە «ناوو ناونیشانی تەواوی دەست بخەنو ئەگەر راستەو بونی هەیە بۆ خەڵکو خوێنەرانی ئاشکرابکەن». عەبدوڵڵا ئەلعەسکەر، کە لەلۆس ئەنجلس، مامۆستای فەلسەفەیە، جەخت دەکاتەوە، «یاداشـــتنامەکە هەڵبەستراوو وەهمییە.. کەســـێک بەناوی همفەر لەهیچ ئەرشیفو

---

١. تحسين ابراهيم الدوسكي: مذكرات الجاسوس.. ل، هەروەها محمد كمال جمعه: دعوه الشيخ محمد بن عبدالوهاب خارج الجزيره العربيه ل٦٣ ـ ٦٥

٢. رياض النجيب الريسي: مصاحف وسيوف.... ل ٣٢٧

٣. سادلير: رحله عبر الجزيره العربيه، ترجمه أنس الرفاعي ل ٥٨ ـ ٨٧

بەڵگەنامەیەکـــی خۆرئاوایی‌و بەریتانیدا بونی نییە، ســـەراپای کتێبەکەش بەرهەمی خەیاڵەو لەساڵانی جەنگی سارددا نوسراوە».
یەکێک لەپیاوە ئاینییەکانی، نەیاری بانگەوازی وەهابییەکان، لەبەرنامەیەکی کەناڵی «المســـتقلە» کە مانگی نیسانی ٢٠٠٩، پەخشکرا، باســـی لەوەکرد، «یاداشتەکانی همفەر» لەلایەن مەرجەعێکی شیعەوە بەناوی محەمەد شیرازیی، هۆنراوەتەوەو ئامانج لێی نابوتکردنی بانگەوازی ســـەلەفییە. ئەم دانپێدانانـــەی پیاوە ئاینییەکەی نەیاری وەهابییەکان، کە ناوی شێخ حەسەن فەرحان مالیکییە، ناوەندوماڵپەڕە سەلەفییەکان، دەیکەنە بەڵگەو گەواهیی ئەو بۆچونەیان، کە چەندین ســـاڵە لەســـەر هەڵبەسراوی یاداشـــتنامەکەو شـــوێنبزریی‌و وەهمی بونی ئەو (همفەر) ناوە دەیخەنەڕو. جگە لەو بەرنامە تەلەفزیۆنییە، حەســـەن مالیکی، لەلاپەڕە ١٢٦ ی کتێبەکەیدا، «قراءة نقدیە لمذهب الشـــیخ محمد بن عبدالوهاب»، دەڵێت «تۆمەتبارکردنی وەهابییەکان بەوەی دەســـتنێژی بەریتانیان، تۆمەتێکی پوچە، ئەو یاداشتانەشی باس دەکرێت گوایە هی (همفەر) ناوێکەو، لەشاری بەسرە محەمەد عەبدولوەهابی دیوەو دژ بەعوسمانییەکان بەرەو ناوچەی نەجد ئاراســـتەی کردوە... هتد. هەموی بوهتان‌و شـــتێکی بێمانایە. چونکە، محەمەد عەبدولوەهاب‌و ئال سعود، ماوەی بیست ساڵ، هەوڵی گرتنی شاری ریـــازو دەوروبەریان داوە، ئەگەر کۆمەکی ئینگلیزیان هەبوایە، پێویســـتیان بەم ماوە زۆرە نەدەکردو بەچەند رۆژێکی کـــەم کۆنترۆڵیان دەکرد». هەروەها مالیکی دەڵێت «لەرێگای هەندێک شـــیعەی میانڕەوەوە زانیومە، شـــیعەیەکی ئیمامی یاداشتەکانی همفەری لەبەرهەمی خەیاڵی خۆی هۆندۆتەوە، ئەگینا کەســـێکی بەریتانی بەم ناوەوە بونی نییە».
جگە لەمانە نوســـەرێکیتری سەلەفی بەناوی (مالیک حەســـەن)، لەژمارە ٣١، ٣٢، ٣٣ ی گۆڤاری (الاصالة) ی ســـەلەفییەکاندا، لێکۆڵینەوەیەکی وردو درێژی لەســـەر بەدرۆخســـتنەوەی «یاداشـــتەکانی همفەر» بڵاوکردوەتەوە باس لـــەوەدەکات، دوای بەدواداچونـــی بەروارو مێژوەکانی نێو یاداشـــتنامەکە دەردەکەوێت، ئەوکاتەی گوایە ســـیخوڕە بەریتانییە گریمانکراوەکە (همفەر)، محەمەد عەبدولوەهابی دیوە لەبەسرە ســـاڵی ١٧١٣ زاینی بوە، شتێکی ئاشـــکراو سەلمێنراویشە کە محەمەد عەبدولوەهاب لە ســـاڵی ١٧٠٣ زاینی لەدایکبوە، کەواتە لەوکاتەدا تەمەنی دە ســـاڵ بوە، ئەمەش ناکۆکو نەگونجاوە لەگەڵ لاپەڕە ٣٠ هەمان یاداشـــتنامە کە لەســـەر زاری ئەو همفەر نـــاوەوە هاتوە، گوایە کاتێک ئەو، محەمەد عەبدولوەهابی لەبەســـرە دیوە، گەنجێکی

قیتو قۆزو تەماعکاربوەو زمانەکانی تورکیو فارسیو عەرەبی زانیوە. هەروەها مالیک حەســـەن دەڵێت «ئەمە بەسە بۆ پوچەڵکردنەوەی ئەو یاداشتانە». ناوبراو، چەندین هەڵەیتری بەروارو زانیاری مێژویی لەم یاداشتنامەیەدا ئاماژە پێدەکاتو دەڵێت «ئەم همفەر ناوە، نەناســـراوەو کوا زانیاری تەواو لەســـەری؟ کوا ناوو ناونیشـــانی تەواوو پیشـــەو ئەرکەکانی لەنێو بەڵگەنامەکانی حکومەتی بەریتانیا؟». هەروەها رەخنەش لەوەدەگرێت کە چاپەکانی کتێبەکە هیچ ناونیشـــانی چاپخانەوساڵی چاپیان لەسەر نییەو ناشـــزانرێت ئەم یاداشتنامەیە بەچ زمانێک نوسراوەو کێو چۆن وەریگێڕاوە بۆ عەرەبی، ئەمە جگە لەوەی بەپێی بەرواری سەر یاداشتنامەکە دەردەکەوێت ١٧٩ ساڵ دوای مەرگی محەمەد عەبدولوەهاب، نوسراوەو مالیک حەسەن دەڵێت «ئەگەر همفەر، هاوچـــەرخو هاوتەمەنی محەمەد عەبدولوەهاب بـــوەو ئەو، هانیداوەو کۆمەکی کردوە، چۆن ١٧٩ ســـاڵ لەدوای محەمەد عەبدولوەهاب ژیـــاوە؟». لەدوا بڕگەی وەڵامەکەیدا مالیک حەســـەن، ئاماژە بەوەدەکات، لەلاپەڕە ٣٨ ی یاداشتنامەکەدا هاتوە «همفەر متمانەی کردوە بە محەمەد عەبدولوەهاب کە سیغەکردن (مارەی کاتی) ژنان حەڵاڵەو سیغەی لەگەڵ ژنێکی مەسیحیدا بۆ رێکخستوە. بێ ئاگا لەوەی محەمەد عەبدولوەهاب، کتێبێکی دژی شـــیعە نوسیوەو لەو کتێبەشـــدا دژی دیاردەی سیغە (مارەی کاتی) وەستاوەتەوەو بەتوندی رەتیکردۆتەوە.

# بەشی دووەم

# بیری سەلەفییەت

سەلەف، لەزمانەوانیدا، واتە: پێشینان. ئەمەش ئاماژەیە بەو کۆمەڵو کەسایەتییانەی لەپێش ئێمەوە رابردونو لەژیاندا نەماون. بەڵام لای سـەلەفییەکان، مەبەسـت لەم زاراوەیە، خەڵکی سـێ چاخە یەکەمەکەی ئیسلام (صحابة، تابعين، اتباع التابعين) ن کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسـلم)، ستایشی کردونو دەربارەیان دەفەرموێت «خير الناس قرني ثم الذين يلونهم، ثم الذين يلونهم، ثم يأتي من بعد ذلك ناس يشهدون ولايستشهدون ويأمنون ولايؤتمنون ويكثر فيهم الكذب»[1]. واتە: باشـترین خەڵک ئەوانەی سەردەمی منـن، دواتر ئەوانەی دوای من، دواتر ئەوانەی دوای ئەوان دێن، لەپاشـان کۆمەڵێک سـەرهەڵئەدەن متمانەیان لەسەر نییەو ناکرێنە شـایەتو درۆکردن لەنێوانیاندا زۆر دەبێـت». لەگێڕانەوەیەکیتـری فەرمودەکەدا هاتوە «خير النـاس قرني، ثم الثاني، ثم الثالث، ثم يجيء قوم لاخير فيهم» صحيح الجامع ٤١٣٠. واتە: باشـترین خەڵک ئەوانەی سەردەمی منن، دواتر دوەمو دواتر سێیەم، لەپاش ئەوانیش خەڵکانێک دێن چاکەیان تێدانییە.

لەئەدەبیاتی سـەلەفییەکاندا، خەڵکی دوای ئەم سـێ سـەردەمە، بەخەلەف، واتە: پاشـین دەناسـرێن. ئەم خەڵکانەش بەهۆی تێکەڵبونیان بەفەلسەفەو شارستانیەتە بیانییەکانـەوە، لەهەندێـک بـواری ئاینیدا جیاواز لەپێشـین بیریـان کردۆتەوەو پێغەمبەریش(صلى الله عليه وسـلم)، دەربارەیان دەفەرموێت «لاخير فيهم». لەسـەردەمی خەلەفدا سـوڵتانو فرمانڕەوا موسوڵمانەکان، خەڵاتو دیاری تایبەتیان تەرخاندەکرد بۆ ئەوانەی سـەرچاوە بیانییە گرێکیو رۆمانیو فارسـییەکانیان وەردەگێڕایە سـەر زمانی عەرەبی، ئەمەش بوبەهۆی سـەرهەڵدانی زانستی کەلامو فەلسەفەی ئیسلامیو زوهدو شـێوە خواپەرستیی سۆفیانە، کە سەراپا لەسـەر جیاوازیو ناکۆکی لەگەڵ تێڕوانینی سەلەف بۆ بیروباوەڕ بنیاتنراوە.

وەهابییەکان کە داکۆکیکەرو درێژەپێدەری تێگەشـتنی سـەلەفیانەن بۆ ئیسـلام،

1. رواه البخاري ٤/١١٨، ابن أبي عاصم ١٤٦٦، ترمذي ٣٨٥٩، أحمد ١/٣٧٨.

ئەوەندەی بۆچونو تێڕوانینەكانیان هەڵقوڵاوی فامو تێگەیشـــتنی پێشینە باشەكانی، ئەوەنـــدە بیروباوەڕو قوتابخانەیەكی عەقیدەیی ســـەربەخۆ نییە.. تێكڕای ناوەڕۆكی گوتـــارو داواكاری وەهابیـــی، زیندوكردنەوەو جێبەجێكردنی بیروباوەڕی پێشـــینانی ئیســـلامو رەتكردنەوەی تەریقەتو داهێنانی پەرستنە لەنێو كۆمەڵگا. وەهابییەكان، جەخت لەســـەر ئەوەدەكەنەوە، «پێویســـتە هەمولایەك لەكانگای دڵەوە سێ چاخە زێڕینەكەی ئیســـلام، بكەنە مەرجەع، بۆ بیروباوەڕو ئیلهـــام وەرگرتن». هەركاتیش خەڵك گەڕانەوە بۆ ســـەر تێگەشـــتنو باوەڕی سێ سەردەمی یەكەمی مێژوی ئیسلام (صحابـــة، تابعين، أتبـــاع التابعين)، ئەوە ئۆتۆماتیكی كۆمەڵگای «ئەهلی ســـوننەو جەماعـــە» لەتیـــۆرو بیردۆزەوە دبنە راســـتیو رەفتار. هەر لەم سۆنگەیەشـــەوە، شوێنكەوتوانی سەلەف پەیوەست نین، بەئاینزایەكی دیاریكراوی ئیسلامیی، لەچەشنی ئاینزاكانـــی حەنەفـــیو مالیكیو شـــافیعیو حەنبەلیی. بەڵكە لەبری شـــوێنكەوتنی ئاینزاكان، داكۆكیو جەخت لەسەر گەڕانەوە بۆ قورئانو فەرمودە، بەتێگەشتنو راڤەی زانایانی پێشـــین، دەكەن.. لەهەمانكاتدا، بۆچونە شەرعزانییەكانی ئیمام ئەحمەدی كوڕی حەنبەلیشـــی لەگەڵدابێت، كە بناغەدانەری فیكری سەلەفییەتە، دەمارگیریان بۆ هیچ ئاینزایەكی دیاریكراونییەو بەلایانەوە ئاســـاییو رەوایە، لەبواری شەرعزانیدا، پەیـــڕەوی لەبۆچونیتری جیاواز لەبۆچونی ئاینزای حەنبەلی، بكەن. بەلای ئەوانەوە، قورئانو فەرمودەی دروست، لەپێش رای شەخسیی سەر مەزهەبەكانی ئیسلامەوەیە. هەروەها لامەزهەبییو شـــوێن نەكەوتنی هیچ رێبەرو تەریقەتێك، یەكێكە لەو شتانەی ئەوان، لەجەماوەری خەلەفی موسوڵمان جیادەكاتەوە كە زۆربەیان پێیانوایە، دەبێت هەموكەس یەكێك لەئاینزاكانی ئیسلام یان تەریقەتەكان هەڵبژێرێت بۆ تەقلیدكردنو نابێت كەس بەبێ ئیمامو رێبەر بمێنێتەوە. شـــێخ محەمەد ناســـرەلدین ئەلبانی، كە داڕێژەو عەڕابی لامەزهەبیی سەلەفییەكانە، لەیەكێك لەموحازەرەكانیدا دەڵێت «لەبری مەزهەبگەرایی.. ســـەلەفییەكان پێیانوایە ئەســـڵ شـــارەزابونە لەشەرعو وەرگرتنی حوكمەكانە راستەوخۆ لەقورئانو ســـوننەت». ئەلبانی، ئەو ئایەتەش دەكاتە بەڵگە كـــە دەفەرموێت «اتَّبِعُواْ مَا أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ وَلاَ تَتَّبِعُواْ مِن دُونِهِ أَوْلِيَاء». الأعراف:٣. واتە: هەرچی لەپەروەردگارتانەوە بۆتان نێردراوەتە خوارەوە، شوێنی كەونو بەغەیرە ئەو، مەكەونە شوێنی سەرپەرستانی دیكە. بەڵام ناوبراو، دان بەوەدا دەنێت، هەموخەڵكی ئاســـاییو ســـادە، ناتواننو لەو ئاستە زانســـتیو توانا زمانەوانیەدا نین، راستەوخۆ ئەحكامو فەتوا، لەقورئانو سوننەت وەرگرن، و بۆ چارەسەری ئەمەش دەڵێت «خودا

بەپێی توانا داواکاری لەخەڵک دەکات، هەرکەس نەیتوانی راستەوخۆ فەتواو ئەحکام لەقورئانو ســـوننەت وەرگرێت، ئەوە ئاساییە پەیڕەوی لەرای ئیمامەکان بکاتو دوای رای ئاینزایەک بکەوێت». ناوبراو، هانی ئەو موسوڵمانانەش دەدات کە خوێندەوارىو شارەزاییان هەیە، بچنە لای زانایانی شارەزاو لەبری پەیڕەویکردنی کوێرانەی ڕاوبۆچونە مەزهەبییەکان، ســـۆراغی بەڵگەکانی فەتواکانیان بکـــەنو ئەوەندەی پێیان دەکرێت لەبـــری تەقلیدی مەزهەبەکان، هـــەوڵ بدەن بزانن رای کامیان بەڵگەدارو دروســـتە، پەیڕەوی لەڕای ئەوەیان بکەن. هەروەها بەبۆچونی ســـەلەفییەکان ئەم لامەزهەبییەی ئەوان، هیچ ناکۆکیو دژایەتی ئیمامەکانی سوننەی تێدانییە، چونکە ئیمامەکان خۆیان چەندین جار جەختیان کردۆتەوە کە فەرمودەی دروست، رێبازی ئەوانەو ئەلبانی لەم بارەیەوە دەڵێت «هەندێک کەس بەوە تۆمەتباریانکردوین کە تانە لەچوار ئیمامەکەی ســـوننە دەدەین، بەڵام چۆن گورگ لەخوێنی یوسفی کوڕی یەعقوب بێئاگایە، ئاوەها ئێمەش لەم قســـەیە بێئاگاین». هەر لەمبارەیەشەوە، محەمەد عەبدولوەهاب دەڵێت «ئێمە شـــوێنکەوتەی: قورئان، فەرمودە، پێشینە باشەکانی ئوممەت، رێبازی چوار ئیمامەکە: ئەبی حەنیفـــەی نوعمان، مالکی کوڕی ئەنەس، محەمەدی کوڕی ئیدریس (شـــافیعی)، ئەحمەدی کوڕی حەنبەلین، رەحمەتی خودایان لێبێت». (بڕوانە مؤلفات الشيخ - القسم الخامس - الرسائل الشخصيه لا ٩٦)

گوتاری وەهابییەکان، کتو مت، وەک بیری سەلەفییەتی سەردەمەکانی ئیمام ئەحمەدو ئیبن تەیمیە، بەســـادەیی دەربڕین، ئاشکرایی مەبەست، بڕوابەخۆبون لەخستنەڕودا، لەدیدگا ئیســـلامییەکانیتر، جیادەکرێتەوە. ئەم بیرو گوتارە، بەشـــێوەیەکی گشتی، لەســـەر دوو بنەمای ســـەرەکی بنەڕەتە، یەکەمیان: جێبەجێکردنی یەکتاپەرســـتی خودایە لەهەمو جۆرەکانی عیبادەت. دوەمیشیان: پاککردنەوەی سەرچاوەو بەرهەمە ئاینییەکانـــە لەفەلســـەفەو بیروبـــاوەڕی گروپەکانی نەیاری بیروباوەڕی پێشـــینانی ئیســـلامو هەروەها پاکژکردنەوەی فەرمودەکانی پێغەمبەری ئیسلامە (صلى الله عليه وسلم) لەفەرمودەی سەنەد لاوازو فەرمودەی هەڵبەسراو.

ئەو ژینگەو دەوروبەرەی محەمەد عەبدولوەهاب، تێیدا کاری دەکردو تێیدا چالاک بو، هیچ پێویستی بەدەربڕینی ناواخندارو فەلسەفەکاری نەبوە، هەر لەبەر ئەمەش بۆچونو بیروڕای ســـەلەفییەکان، لای هەموکەس ئاشـــکرایەو بەکورتی هەموی لەچوارچێوەی «بەتاک ناسینو بەتاک پەرســـتنی خودا» کورت دەبێتەوە. گوازرشتکردنی محەمەد عەبدولوەهـــابو قوتابخانەکەی لەمەســـەلەی یەکتاپەرســـتی قەتعـــیو یەکلایەنەیەو

بەبەردەوامیی لەدەوری چەند پێوەرو تێگەشتنێکی لێکچوی جێگیر چەقی بەستوە، کە سازشــکردنو کارلێککردن، لەگەڵ بۆچونیتری جیاوازو پێچەوانەدا قبوڵ ناکات[1]. هەر ئەمەش وایکردوە نەیارەکانیان بە «وشک، لەخۆبایی» ناودێریان بکەن. بەپێچەوانەی رێچکە عەقیدەییەکانی تەسەوفو گروپە ئیسلامییە فەلسەفیو عەقڵانییەکانیتریشەوە، گوتارو بەرهەمی سەلەفییەکان هیچ زاراوەسازیو گرێو ئاڵۆزیو پێچو پەنای زمانەوانیو گوزارشــتکردنی تێدانییە، بەجۆرێک هەرکەس خوێنــدەواری هەبێتو زمانی عەرەبی بزانێت، بەسانایی دەتوانێت لێی حاڵی ببێت.

---

١ـ محمد جابر الانصاری، الفكر العربى وصراع الاضداد ل ٢٥

# یەکتاپەرستی لەبیری سەلەفیدا

ســـەلەفییەکان پێیان وایە، ئاینی ئیســـلام، هێندەی جەخت لەسەر، یەکتاپەرستیو بەتاک ناسینی خودا، دەکاتەوە، ئەوەندە، جەخت لەسەر باوەڕهێنان بەبون (وجود) ی زاتـــی خوا ناکاتەوە. چونکە بونی خودا ســـەلمێنراوێکی سروشـــتیو فیترەتییە، بـــەڵام یەکتاپەرســـتی خودا، فەرامۆشـــکراوەو کێشـــەو تەئویلی زۆر دایپۆشـــیوە. بـــۆ پشتڕاســـتکردنەوەی ئەم بۆچونەشـــیان، ئاماژە بەپەناگرتنی خەڵک بەشـــێخو پیاوچاکەکانو دارودرەختو گۆڕەکانو ســـوێند پێخـــواردنو هیوابون بەکاریگەرییان، دەکەن کە بەشێوەیەکی بەربڵاوو لەژێر پەردەی خواپەرستیو لەچوارچێوەی ئیسلامدا لەهەمولایەکی جیهانی ئیسلامیدا ئەنجامدەدرێن [1]*.

هەرچەندە بەرواڵەت، بیرۆکەی یەکتاپەرســـتی سادەو ئاسانە، بەڵام کاریگەری زۆری لەســـەر باری دەرونیو رەفتاری کۆمەڵایەتی تاکی موســـوڵمان هەیە.. ئەم شـــێوە خواپەرســـتییە، جەخت لەپەیوەســـتبونی تەواوەتی مرۆڤ تەنهـــاو تەنها بە (الله) دەکاتەوە.. هەســـتو هۆشی بەدوردەخاتەوە لەهەمو چەشـــنە کاریگەریو پیرۆزیو تارماییەکیتـــری گریمانکراوی دەســـتکرد.. ســـەربەخۆییەکی خۆبەخۆیی بۆ مرۆڤ، بەرامبەر هەمو ئەو شـــتانەی دروســـتکراوی خودان، دەستبەردەکات. بەکوردییەکەی

---

١ـ محمد عبدالوهاب: کتاب التوحید، ل ١٠ ـ ٢٠

* بەڵگەی سەلەفییەکان بۆ لەپێشتریی یەکتاپەرستی خودا، کۆمەڵێك ئایەتی قورئانە لەوانەش: «ومن أضل ممن يدعو من دون الله من لا يستجيب له إلى يوم القيامة وهم عن دعائهم غافلون» (الأحقاف ٥). «يدعو من دون الله ما لا يضره وما لا ينفعه ذلك هو الضلال البعيد « (الحج ١٢ ). «ولا تدع من دون الله ما لا ينفعك ولا يضرك فإن فعلت فإنك إذا من الظالمين» (يونس ١٠٦).» ألا لله الدين الخالص والذين اتخذوا من دونه أولياء ما نعبدهم إلا ليقربونا إلى الله زلفى إن الله يحكم بينهم فيما هم فيه يختلفون إن الله لا يهدي من هو كاذب كفار». (الزمر ٣). «إنهم لن يغنوا عنك من الله شيئا وإن الظالمين بعضهم أولياء بعض والله ولي المتقين»(الجاثية )١٩. «ويعبدون من دون الله ما لا ينفعهم ولا يضرهم وكان الكافر على ربه ظهيرا» الفرقان ٥٥. «ويوم يحشرهم وما يعبدون من دون الله فيقول أأنتم أضللتم عبادي هؤلاء أم هم ضلوا السبيل» (الفرقان ١٧). «والذين يدعون من دون الله لا يخلقون شيئا وهم يخلقون» (النحل ٢٠). «قل إني نهيت أن أعبد الذين تدعون من دون الله قل لا أتبع أهواءكم قد ضللت إذا وما أنا من المهتدين (الأنعام ٥٦). «ولا تدع من دون الله ما لا ينفعك ولا يضرك فإن فعلت فإنك إذا من الظالمين»(يونس ١٠٦).

رزگارکردنـــی ناخ‌و رۆحی مرۆڤـــە لەهەژمونی رۆحیی مرۆڤێکیتـــر، ئیتر ئەو مرۆڤە پەناپێبراوە، هەر ناوو ناونیشـــانێکی ئاینی‌و دنیایـــی هەبێت. بەپێی ئەم بیروباوەڕە هەمو مرۆڤێکی موسوڵمان لای خودا خاوەن قوربو قورساییەو هەمویان بێ جیاوازی‌و وەک یـــەک، دەتوانن بەبێ نێوانگرو واســـیتە لەخودا بپاڕێنەوەو داواکاری ئاراســـتە بکەن‌و پەشـــیمانی‌و رازونیازی خۆیانی عەرزبکەن، چونکـــە خودا دەفەرموێت « وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ» غافر: ٦٠. واتە: پەروەردگارتان گوتویە: لێم بپاڕێنەوە، ئەوسا بەدەنگتانەوە دێم.

پشـــکی شـــێری هەمو وتارو بەرهەمەکانـــی محەمەد عەبدولوەهاب، بـــۆ بیروباوەڕی یەکتاپەرستی، تەرخانکراوە. بەڕای شوێنکەوتوانیشی بیروباوەڕی دروستو پاڵفتەکراو، لەخـــەوش‌و خاڵ، بنەمـــاو بنەڕەتی ئاینداریيـــە. بەبێ عەقیدەو باوەڕی دروســـت، ســـەرەنجام‌و چارەنوسی ئاینداریش هەرەسهێنان‌و لەناوچونە[1]. هەروەها بەڕای ئەوان، خودا هەمو مرۆڤایەتی‌و جیهانی تەنها، لەپێناو یەکتاپەرســـتیدا دروســـتکردوەو ئەم یەکتاپەرستییەش سەرجەم لایەنەکانی پەرستن، حوکمڕانی، سیاسەت، جێگیرکردنی ســـیفات بۆ خودا، دەگرێتەوە[2]. ئەوان، بەپشت بەســـتن بەبۆچونی ئیمام ئەحمەدو ئیمامـــی زوهری‌و تەحاوی‌و ئیبن تەیمییە، کاروکردەوەی مرۆڤ، بەبەشـــێکی گرنگی بیروبـــاوەڕ، ئەژمار دەکەن‌و جەخت دەکەنەوە، یەکتاپەرســـتی تـــەواو ئەوەیە لەدڵ، زمـــان‌و ئاخاوتن، کردەوەدا، رەنگ بداتەوە.. تەنها ئەوە بەس نییە مرۆڤ بەدڵ خودا بەتاکو تەنهـــا بزانێت‌و ئەوەی بەکردارو گوفتارو بیروبـــاوەڕ، خودا بەتاک دانەنێت، بڕواداری تەواوو کامڵ نییە[3].

بەپێی بیروباوەڕی یەکتاپەرســـتانەی سەلەفیی، پەنابردن بۆ پێغەمبەرانی خوداش، هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ خەڵکانیتردا نییەو ئەمەش پەکتاپەرستی پوچەڵ دەکاتەوە، چونکـــە لەقورئاندا هاتوە «إِنَّ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ عِبَادٌ أَمْثَالُكُمْ»الأعراف: ١٩٤. واتە: ئەوانـــەی کە - لەجێی خودا - ئێوە هانایان پـــێ دەبەن، عەبدگەلێکن وەک خۆتان. هەروەهـــا قورئـــان فەرمان بەپێغەمبەری ئیســـلام دەکات بڵێت «قُلْ لَا أَمْلِكُ لِنَفْسِي نَفْعًا وَلَا ضَرًّا إِلَّا مَا شَاءَ اللَّهُ وَلَوْ كُنتُ أَعْلَمُ الْغَيْبَ لَاسْتَكْثَرْتُ مِنَ الْخَيْرِ وَمَا مَسَّنِيَ السُّوءُ إِنْ

---

١. عبدالله عبدالحميد الاثری: الوجيز فی عقيده السلف الصالح، ل ٣٤

٢. محمد بن جميل زينو: العقيده الاسلاميه فی الكتاب والسنه الصحيحه، ل ٢٣

٣. محمد بن عبدالوهاب: كشف الشبهات، تعليق محمد بن صالح العثيمين، ل٩

أَنَا إِلَّا نَذِيرٌ وَبَشِـــيرٌ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ» الأعراف: واتە: ئەی پێغەمبەر بێژە: من خاوەنی ســـودو زیانـــی خودی خۆم نیم، مەگەر خودا حەزبکات. ئەگەر نادیارم بزانیایە بەهرەی فرەم چنگ دەکەوتو هەرگیز زیانم توش نەدەهات. من هەر تەنیا ترســـێنەرو مژدەدەرم بۆ کەســـانێک بڕوادارن. بەهەمانشێوەش سەلەفییەکان، هیوا هەڵپەساردن بە بەرەکەتی درەختو نەزرگاو پەرۆو مورووی سەر گۆڕەکانو قوربانیکردن بۆیان، هەروەها بڕوابون بە پێشبینی بورجو کەلوەکانو جادووکردنو بەکڵۆڵ دانانی هەندێک لەرۆژەکانی ساڵو هەندێک لەگیانەوەران، بەپێچەوانەو دژی چەمکی یەکتاپەرســـتی دادەنێنو پێیانوایە ئەمانە، بڕوای مرۆڤ بەخودا لاواز دەکەن، چونکە خودا لەقورئاندا، دەفەرموێت «أَمَّن يُجِيبُ الْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِـُـفُ السُّـــوءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَاءَ الْأَرْضِ أَإِلَهٌ مَّـعَ اللَّهِ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ) [النمل: ٦٢]. واتە: ئایا ئەو کەســـە چاکترە کە هومێد بڕاوەکان لێی دەپاڕێنەوە ـ یان خـــودا ـ کە بەهانایەوە دێتو لەتەنگی ڕزگای دەکاو دەتانکانە جێنشـــێن لەم ســـەر زەمینە؟ ئاخۆ هیچ پەرســـتراوێکی وەک خودا هەیـــە؟ ئەمانە کەم پەند وەردەگرن. هەروەهـــا دەفەرموێت «وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنْ يَدْعُو مِنْ دُونِ اللَّهِ مَنْ لَا يَسْـتَجِيبُ لَـهُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ وَهُمْ عَنْ دُعَائِهِمْ غَافِلُونَ) الأحقاف: ٥. واتە: کێ لەو کەسە گومڕاترە، کە هاوار بۆ غەیرەز خـــوا دەبا؟ هاوار بۆ کەســـێ دەبا هەتـــا قیامەت وەڵامی ناداتەوەو هەر ئاگاشـــیان لەپاڕانەوەیان نییە.

ســـەلەفییەکان، بڕوابون بەبونی زاتی خوداو بڕوابون بە ســـیفاتی چێکاریی (خالق)و ڕۆزیدەریـــی (رازق) ی خـــودا، بەیەک بەش لەســـێ بەش (٣/١) ی یەکتاپەرســـتی دەدەنەقەڵەم، باس لەوەش دەکەن ئەم جۆرە بڕوابونە بەخودا جگە لەکۆمۆنیستەکانی روســـیاو شـــیوعییەکانی چین، لای جولەکەو گاورەکانی ئەوروپاش هەیە، بۆیە لەمە گرنگتر بەلای ئەوانەوە تەنیاکردنی خودایە لەهەمو پەرستشێکدا کە ڕێبازی تەوحیدی راســـتەقینەیە. هەرەوەها چەندین جار ئاماژەیان بەوەکردوە، تەنانەت موشریکەکانی ســـەردەمی پێغەمبەریش(صلی الله علیه وسـلم )، دانیان بەبونی خوادا ناوەو ئەوەتا قورئان دەفەرموێت «وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ فَأَنَّى يُؤْفَكُون» الزخرف: ٨٧. واتە: ئەگەر لەخۆیان بپرســـی، کێ ئەوانی وەدی هێنا، ئێژن خـــودا. دەی چۆن لەهەق کلادەبن. «وَلَئِنْ سَـــأَلْتَهُمْ مَنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ فَأَنَّى يُؤْفَكُونَ» العنكبوت٦١. واتە: ئەگەر لەمانە (قورەیشـــییەکان) بپرســـی: کێ ئاسمانو زەمینی وەدیهێناو خۆرو مانگی دەســـتەمۆکرد؟ بێگومان دەبێژن: خودا. دەسا چۆن لەڕێگای هەق کلا دەکرێن؟ «لَئِنْ سَـــأَلْتَهُمْ مَنْ نَزَّلَ مِنَ السَّـــمَاءِ مَاءً فَأَحْيَا بِـهِ الْأَرْضَ مِنْ بَعْدِ مَوْتِهَا

لَيَقُولُنَّ اللَّهُ قُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لا يَعْقِلُونَ» العنكبوت٦٣. واتە: ئەگەر لەمانە بپرسی کێیە وا لەو حەوایەوە باران دادەبارێنێو هەر بەو ئاوە زەوی زیندو دەکاتەوە پاش مردنی؟ بێگومان دەبێژن: خودا. بێژە شوکرانە بۆ خوا. بەڵام زۆربەی ئەمانە هۆش ناگرن. «وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ مَنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ قُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لا يَعْلَمُونَ» لقمان: ٢٥. واتە: ئەگەر لەوانە بپرسی: کێ عاسمانو زەمینی وەدی هێنا؟ ئێژن: خودا. تۆ بێژە: شوکر بۆ خوا، بەڵام زۆربەیان نەزانن. بۆیە بەلای سەلەفییەکانەوە هیچ هونەر نییە، خەڵکی موسوڵمان دان بەبونی خوادا بنێنو ئەڵێن «ئەگەر تەنها بڕوابون بەبونی خوا، بەس بوایە، ئەوە موشریکەکان بڕوایان پێی هەبوەو ئەو هەمو ئایەتەی قورئان دەربارەی یەکتاپەرستی نەدەهاتە خوارەوە».

بەڕای محەمەد عەبدولوەهاب، شەریک دانان بۆ خوا لەنێو موسوڵمانانو، لەجیهانی ئیسلام، لەشەریک دانانی قورەیشییەکانی سەردەمی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، خراپتربوە، چونکە وەک لەقورئاندا باسکراوە، قورەیشییە بێباوەڕەکانی سەردەمی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، لەکاتی تەنگانەو پێگیراندا، وازیان لەبتو پەرستراوەکانیتریان دەهێناو دەگەڕانەوە بۆلای خواو تەنها هاواریان بۆ الله دەبرد، بەڵام موسوڵمانەکانی سەدەکانی پاشین لەهەمو ساتو کاتێکدا وابەستەو شوێنکەوتەی درەختو پیاوچاکو پەرستراوەکانیتریان بونو هیچ کات دەستبەرداریان نەدەبون.

تەوەرێکیتری سەرەکیی بیری سەلەفی، بڕوابونە بەو سیفەتو ئاکارانەی خودا کە لەقورئاندا ناویان براوەو ئاماژەیان پێکراوەو زانایانی پێشینی ئیسلام وەک خۆی وەریانگرتوە، بەبێ پێچ تێدانو راڤەکردنی خۆ بواردنو بەبێ واتاکردنو لێکدانەوەی جیاوزاو پێچەوانە لەمانای دەقاودەقی زمانەوانیی ئایەتەکان. هەروەها، پێیانوایە خودا سیفەتەکانی: بیستن، بینین، خۆشەویستی، رومەت، چاو، بەرزو بڵندیی لەسەر عەرش، هەروەها سیفەتی پێکەنینی هەیە کە لەقورئاندا ئاماژەیان پێکراوەو دراونەتە پاڵ خودا. ئەم سیفەتانەش بەشێوەیەکن کە شایستەن بەزاتی خۆیو لەسیفاتی مرۆڤ یان هیچ دروستکراوێکیتری خودا ناچن، لەکاتێکدا قورئانی پیرۆزیش لەسورەتی شورا بەئایەتی «لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ» گوزارشتی لەبێ وێنەیی خودا کردوە، لەهەمان کاتدا، سیفەتی بیسەرو بینایی بۆ جێگیرکردوەو هەر دوای ئەمەش دەفەرموێت «وَهُوَ السَّمِيعُ البَصِيرُ»[1] ئەم بۆچونانەی وەهابییەکان، هێندەی ئەوەی

١. بڕوانە: محمد خليل هراس: شرح العقيده الواسطيه، ل ٣٧. هەروەها، عبدالاخر حماد االغنيمى: المنحه الالهيه، ل ٧٨

کە زیندوکردنەوەو جێبەجێکردنی ڕێبازی زانایانی پێشـــینی ئیسلامە، لەسەر ئەرزی واقیع، ئەوەنـــدە داهێنانو نوێگەری نییە، لەبیروباوەڕی ئیســـلامیدا. چونکە بەر لە محەمـــەد عەبدولوەهابو شـــوێنکەوتەکانی، هەریەک لە ئیمـــام ئەحمەد ١٦٤ ـ ٢٤١ کۆچـــی، ئیمامی تەحاوی ٢٣٧ ـ ٣٢١ کۆچی، ئیبن تەیمیە ٦٦١ـ ٧٢٨ کۆچی، ئیبن ئەبی ئەلعیز ٧٣١ ـ ٧٩٢کۆچی، کاری تیۆریزەکردنو گەڵاڵکردنی ئەم بیروباوەڕانەیان بەئەنجام گەیاندوەو وەک یەکێک لەبەناوبانگترین ڕێبازگەکانی عەقیدەی ئیســـلامیی‌و وەک بیروباوەڕی ســـەلەف ناســـاندویانە[1]، بەڵام دوای مەرگی ئەمانەو باڵادەستبونی عوســـمانییەکانو هەندێک هۆکاریتر، لەجیهانی ئیســـلامیدا، ئـــەم تەرزە بیروباوەڕە، لەبواری جێبەجێکردندا پاشەکشەی کردو کەوتە گیانەڵا.

تێڕوانینی ســـەلەفیانە، بۆ عیبادەتکردنو بەتاک ناســـینو بەتاک پەرســـتنی خودا، هیـــچ ناکۆکیو ناجۆرییەکی لەگەڵ بیروباوەڕی ســـێ ئیمامەکەیتری ســـەر مەزهەبی سوننەکان، ئەبوحەنیفە، مالیک، شافیعیدا، نییەو ئەوانیش تێڕوانینێکی هاوشێوەیان بۆ چەمکی یەکتاپەرستی هەیە [2]. جگە لەمەش لەهەمان سەدەو سەردەمی دەرکەوتنی ســـەلەفییەکانی سعودییەدا، لەیەمەن، پێشـــەوایەکیتری ئیسلامی بەناوی شەوکانی، بەشێوەیەکی ســـەربەخۆ، بەڵام هاوشێوەی سەلەفییەکان، بانگەشەی بۆ بیروباوەڕی پێشینانی ئیسلام کردوەو هەمان تێڕوانینی وەهابییەکانی لەسەر یەکتاپەرستی هەیە. شـــەوکانی راشـــکاوانە دەربارەی هاوارکردنە پیاوچاکەکان لەیەمەنو دەڵێت «ئەمە شەریک بۆ خوا دانان نەبێت، هیچ شەریک بۆ خوا دانان نییە». ئەمەش، ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێت، بیروباوەڕی سەلەفییە وەهابییەکان داهێنانو تاقانە نییە[3].

---

١ـ بڕوانە: أبراهيم العسعس: السلف والسلفيون (رؤيه من الداخل)، ل ٢٠ ـ ٣٠

٢ـ ٩٩ بۆ زیاتر بڕوانە: د. محمد بن عبدالرحمن الخميس: أعتقاد الائمه الاربعه، ابى حنيفه ومالك والشافعى وأحمد.

٣ـ بڕوانە: محمد بن على الشوكانى: نيل الاوطار، تحقيق على محمد معوض وآخرون، المقدمه.

# سەلەفییەتو بیدعە

رونکردنەوەو شــرۆڤەکردنی واتای بیدعــە*[1]، پانتاییەکی گەورەو بەرفراوانی گوتاری ســـەلەفییەکان داگیردەکات. پوختەی ئەم گوتـــارەش جەختدەکاتەوە، «هەمو ئەو پەرستشـــانەی لەدوای وەفاتی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)و سەردەمی سەحابەکانی، لەخۆڕا داهێنـــراون‌و هیچ فەرمانێکی خودایی یان دەقی فەرمودەیان لەپشـــت نییە، داهێنراوی بێسودن‌و پێویستە موســـوڵمانان وازیان لێ بێنن‌و لێیان دوربکەونەوە»[2]. بەهەمانشـــێوە هەمو ئەو بیروبۆچونە ئاینیانەشـــی پشت ئەســـتورن بە میتافیزیکو فەلســـەفەو لەدیدو لۆژیکو لێکدانەوەی فەیلەســـوفانی یۆنانەوە، سەرچاوەیانگرتوەو دەقی راشـــکاویان لەســـەرنییە، رەتدەکرێتەوە، چونکە «لەسۆنگەیەکی خۆرئاواییو یۆنانی دور لەدەقەکانی شـــەریعەت، هەڵهێنجراون». هەروەهـــا پێیانوایە، عەقیدەو بیروبۆچونی قوتابخانەو گروپە ناســـەلەفییەکانی ئیســـلام «سیخناخە لەبۆچونی بت پەرســـتانەی ئەرەستۆو ئەفلاتۆن‌و شلۆتیو پلۆتی فەیلەســـوفەکانی هیندستان‌و وڵاتی فارس‌و بەتێکڕا، کوشتەی دەست پەتای بیدعەو بۆچونی نائیسلامیانەن».

لەفەرهەنگو گوتاری ســـەلەفیەتدا، چەمکو زاراوەی بیدعە، دژو پێچەوانەی زاراوەی ســـوننەتە، واتە لەهەرکوێدا بیدعە هەبو، مەرگی ســـوننەتو خواپەرســـتیی راستو دروست، مسۆگەرو ئامادەیە[3]، مەبەستیشیان لەبیدعە هەمو ئەو کردارو پەرستشانەیە کە دوای ســـێ چاخە پەسەندەکانی ئیسلام، بەمەبەستی نزیکبونەوەی زیاتر لەخودا، داهێنراون‌و تێکەڵ بەئەرکو دروشـــمە ئاینییە بنەڕەتییەکانی ئیسلام کراون. نمونەی ئەم پەرستشـــە بیدعانەش زۆرن لەوانەش: یادکردنەوەی ســـاڵیادەکانی لەدایکبونی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)، خوێندنی ئەزکار بەر لەنوێژە فەرزەکان، یادکردنەوەی خودا بەدەنگـــی بەرزو بەکۆمەڵ، خوێندنی ســـورەتی فاتیحا بۆ رۆحی مردو، تەڵقینکردنی مردو، خوێندنی قورئان لەپرسە، بیناکردن لەسەر گۆڕو..........هتد.

---

١. زاراوەی بیدعە، لەزمانی عەرەبیدا، واتە شتێکی دهێنراو یان بێ پێشینە. ئەم داهێنراوەش بۆ هەردو جیهانی چاکەو خراپە بەکاردێت. بڕوانە ابن منظور: لسان العرب، ٧/٨

٢. عبدالله بن عبدالحمید الاثری: الوجیز فی لعقیدە... ل ١٧٠

٣. د. سفر بن عبدالرحمن الحوالی: مناهج الاشاعرە فی االعقیدە، ل١٦

جگە لەداهێنانەکانی بواری خواپەرستییش، سەلەفییەکان، هیچ کێشەو گرفتیان لەگەڵ داهێنراوە ماددیو تەکنەلۆژییەکانی ژیانی نوێو سەردەمدا نییە، چونکە ئەمانە هیچ کارناکەنە سەر نێوەڕۆکو پەیامی ئیسلامو بگرە دەکرێت بۆ خزمەتکردنو پەرەپێدانیشی بەکاربهێنرێن [١].

سەلەفییەکان، پێیان وایە ئەگەر تاکی موسوڵمان شارەزایی باشی دەربارەی بیدعەناسیو جۆرەکانیو چەمکو مانای بیدعە نەبێت، ئەوە دەبێتە نێچیری دەستەمۆی بیدعەو ناتوانێت لەئیسلامی پاکو راستەقینە تێبگات[٢]. سەرەنجامو چارەنوسی بیدعەچییەکانیش بەلایانەوە دۆزەخو سزای خودایە، ئەگەر بزانن پەرستشەکەیان بیدعەیەو لەگەڵ ئەوەشدا بەنیازی نزیکبونەوەی زیاتر لەخودا لەسەری سوربن[٣]. هەروەها ئەوان، بەدەنگی بەرزو بەهەموجۆرێک دژ بەو بۆچونانەی هەندێک لەقوتابخانە ئیسلامییەکان، دەوەستنەوە کە بیدعە پۆلێن دەکات بۆ بیدعەی چاکو بیدعەی خراپ، (البدعه الحسنه والبدعه السیئه)، لەمەشدا فەرمودەیەکی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، دەکەنە بنەڕەت کە رونو رەوان دەفەرموێت «کل بدعه ضلالة». واتە: هەمو بیدعەیەک تاریکیو گومڕاییە[٤]. پوختەی بیرکردنەوەی ئەوان دەربارەی بیدعە لەفەرمودەیەکیتری دروستی پێغەمبەرەوە(صلی الله علیه وسلم)، هاتوە کە بەسەحابەکان، دەفەرموێت «...... من یعیش منکم فسیری أختلافا کثیرا، فعلیکم بسنتي وسنة الخلفاء الراشدین المهدیین من بعدی.... وایاکم ومحدثات الامور، فأن کل محدثة بدعة وکل بدعه ضلالة». واتە: ئەوەی لەئێوە زۆر بژی، ناکۆکیو کێشمەکێشی زۆر دەبینێت. ئەوکات لەسەرتانە دەست بەسوننەتی منو خەلیفە راشیدینەکانەوە بگرن. نەکەن لەخۆتانەوە شت دابهێنن، چونکە هەمو داهێنانێک (لەبواری عیبادەتدا) بیدعەیە، هەمو بیدعەیەکیش گومڕاییو تاریکییە. جگە لەمەش، بوخاریو موسلیم دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)، فەرمویەتی «من عمل عملا لیس علیه امرنا فهو رد» واتە: هەرکەس کارێک ئەنجامبداتو ئێمە فرمانمان پێ نەکردبێت، رەتدەکرێتەوە.

لەتەرازوی سەلەفییەکاندا، حوکمی بیدعە بەپێی جۆرو بارودۆخەکەی دەگۆڕێت.

---

١ ـ سلیم الهلالی: البدعه واثرها السیء فی الامه، ل٦

٢ـ علی بن حسن بن علی الحلبی: علم أصول البدع، ل ٣٨

٣ـ هەمان سەرچاوەی پێشو، ل ١٠٤

٤ـ د. صالح بن فوزان بن عبدالله الفوزان: کتاب التوحید، ل ١٤٠

هەندێــک بیدعــە دەگەنە پلەی کوفــر، هەشــیانە حوکمی تاوانـــی بچوکی هەیە. ئەوانەی کوفرو شــیرکن، زیاتــر پەناگرتن بەخەڵکانیتــرو قوربانیکردنن بۆ جگە لە خودا، ئەوانەشـــی دەروازەو ســـەرەتای خراپەو نەفامین، بەکارهێنانی مەقامو خاتری پیاوچاکانن لەنزاکردنو پاڕانەوەداو ســوێندخواردنە بەجگــە لەخوداو....هتد. بەڵام بەشێوەیەکی گشــتی، بیدعەکردن، بەسەرەتاو دەروازەی چونەنێو بازنەی تاوانکردن دەدەنە قەڵەمو بەلایانەوە هەمو بیدعەکان، لەخاڵی هاوبەشـــی «ضلالە»و گومڕاییدا هاوبــەشو یەکســـانن[1]. هەروەها بەلای ئەوانـــەوە ســـەرکۆنەکردنی بیدعەچییەکان، بەشێکە لەجیهاد، خونکیو مەراییکردنیش بۆیان، هاندانو دانپێدانانی بیدعەکەیانە[2]. لەمبارەیــەوە ئیمام ئەحمـــەدی کوڕی حەنبەل دەڵێت «نابێت بــۆ هیچ کاروبارێکی موســـوڵمانان پشــت بەبیدعەچییەکان ببەســرێت، چونکە ئەوە گەورەترین زیانە بۆ ئاین». هەروەها دەڵێت «لەهیچ شــتێکی ئایندا پرسو ڕا بەبیدعەچییەکان مەکە». مالیکی کوڕی ئەنەس کە لەپێشینانی ئیسلامە، هەڵوێستی لەئیمام ئەحمەد، توندترە دژی ئەوانـــەی داهێنان لەعیبادەتدا دەکەنو لە (المدونـــە الکبری) دا دەڵێت «ژنو ژنخوازی لەگەڵ بیدعە چییەکاندا ناکرێتو سڵاویشیان لێناکرێت».

خۆپارێزی زۆری وەهابییەکان لەبیدعەو وابەســـتەیی توندیـــان بەدەقەکانی قورئانو فەرمودەوە، وایکردوە، بەتوندی دژی هەمو ئەو دابو نەرێتە کۆمەڵایەتیانە بوەستنەوە کە لەگەڵ دەقەکانی شەریعەتدا ناگونجێنو هیچ بنەمایەکیان لەقورئانو فەرمودەدا نییە. بەهۆی ئەوەشی زۆرێک لەکۆمەڵگا ئیســلامییەکانی خۆرهەڵات، پڕن لەدابو نەرێتی جۆراوجۆری بێ بنەما لەشـــەریعەتی ئیسلامدا، کێشەی گەورە بۆ بانگەوازی سەلەفی دروستبوەو دابڕانو کەلێن کەوتۆتە نێوان ئەم تەوژمەو قوتابخانەو بیرکردنەوە ئاینیو کۆمەڵایەتییە باوەکانی نێو ئەم کۆمەڵگایانەوە. ســـەلەفییەکان خۆشــیان ئەوەندەی چەســپاندنی ڕێبازەکەیان بــەلاوە گرنگە ئەوەندە دەربایســـی زیاترکردنی جەماوەرو لایەنگرنینو گەلێک جار شانازی بەکەمایەتی خۆیانەوە دەکەن. تەنانەت شێخ محەمەد ناسرەلدین ئەلبانی، لەیەکێک لەوتارەکانیدا دەڵێت «سەلەفییەکان بەژمارە کەمن بەڵام بەبەڵگەو شوێنکەوتنی هەق بەهێزن». ڕێبەرە سەلەفییەکانیتریش وتەیەکی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودیان کردۆتە دروشم کە دەڵێت «جەماعە (ئەو گرۆیەی پێغەمبەر مژدەی

[1]. عبدالله بن عبدالحمید الاثری: الوجیز فی العقیدە... ل ١٧١.

[2]. د. ربیع بن هادی عمیر المدخلی: منهج أهل السنە والجماعە فی نقد الرجال والکتب والطوائف، ل ٣٧

بەهەشتی پێداوە لەنێو ٧٣ گرۆ ئیسلامییەکەیتر) ئەوەیە کە لەگەڵ راستیدا بگونجێت، ئەگەر خۆشـــت بەتەنها بیت». بۆ کەمی ژمارەی شوێنکەوتوانیشـــیان، دڵی خۆیان بەفەرمودەیەکی پێغەمبەر (صلى الله عليه وســلم)، دەدەنەوە کە لەســـەحیحی موســـلیمدا هاتوەو دەفەرموێت «بدأ الاسلام غريبا، وسيعود غريبا كما بدأ، فطوبى للغرباء». واتە: ئیسلام بەنامۆیی‌و کەمینەیی دەستیپێکردوە، لەداهاتوشدا هەر کەم‌و نامۆ دەبێتەوە، بەهەشـــت بۆ موســـوڵمانە نامۆو غەریبەکانە. دەربارەی شوناســـی کەمینەو غەریبە موسوڵمانەکانیش، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، چوار پێوەرو لێکدانەوەی بۆ دیاریکردنیان ئاماژە پێکردوە یەک لەوانە «الذين يصلحون اذا فســـد الناس» واتە: «کاتێک خەڵک خراپن، ئەوان چاکسازی دەکەن». لێکدانەوەیەکیتریان دەفەرمێت «الذين يصلحون ما أفسد الناس». واتە «کۆمەڵێکن خراپەی خەڵک چاک دەکەن». سێیەم لێکدانەوەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وســلم)، غەریب‌و نامۆ بەهەشـــتییەکانی موسوڵمان بە «النزاع من القبائـــل»، واتە: «یەک دوو کەس لەهەر هۆزێک» دیاری دەکات. لەکۆتا جاریشـــدا دەفەرموێت «صالحون قليل، في قوم ســـوء كبير» واتە «خەڵکانێکی راساڵن، لەنێو کۆمەڵێک خراپەکاری زۆردا». بەبۆچونی لیژنەی هەمیشـــەیی فەتوای سعودییش کە لەفەتوای ژمارە ١٧٠/٢، دا بڵاویانکردۆتەوە، لەهەر چوار حاڵەتەکەدا کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، ئاماژەی پێکردوە، غەریب‌و نامۆکان ئەوانەن کە «پەیوەستن بەسوننەتی راستەقینەو خۆیان لەبیدعە بەدور دەگرن، چونکە لەئێستا بەژمارە موسوڵمانان کەم نین بەڵکە بەملیۆنەها کەســـن، بەڵام ئەوانەیان کە دەستیان بەئیسلامی راستەقینەو دور لەبیدعەو خەوش‌و خاڵەوە گرتوە، کەمینەو نامۆو غەریبن».

# سەلەفیەتو جیهاد

سەرهەڵدانی بزوتنەوەی وەهابی، لەکاتێکدابوە کە خەلافەتو دەسەڵاتێکی ئیسلامیی لەسەردەستی تورکە موسوڵمانە عوسمانییەکان لەجیهانی ئیسلامیدا بەرقەراربوە. زۆربەی هەرەزۆری قوتابخانەو رێچکە ئیسلامییەکانیش لەگەڵ بونی دەوڵەتێکی ئیسلامیدا کە حوکم بەشەریعەت بکات، رێگا نادەن کەس شۆرشو بزاڤی چەکداریی بەناوی ئیسلامەوە، بەرپابکات. ئەم ئیشکالەش کەلای وەهابییەکان، پاساوو لێکدانەوەیەکی تایبەتی هەیە، رایەکی گشتیی دروستکردوە کە وەهابییەکان بە «سەرپێچیکارو هەڵگەڕاوە لەخەلافەتی موسوڵمانان» تۆمەتبار دەکات.

مێژوی سیاسیو سەربازیی وەهابییەکان، ئاماژەنمای ئەوەی لێدەخوێنرێتەوە، کە گوتاری ئەم رێبازە ئاینییە دەربارەی جیهاد، بەپێی رۆژگارو حاڵەتە جیاجیاکان، گۆڕانکاریی بەسەردا هاتبێت. واتە گوتارو فیقهێکی گۆڕاوو داینامیکییە. بۆ نمونە زاناکانی سەر بەم تەوژمە ساڵانی هەشتاکان، جیهادکردنیان دژ بە یەکێتی سۆڤیەت لەئەفغانستان، بەپیرۆزو واجب لەقەڵەم دەدا، کەچی ئێستا نازناوی «گومڕاو سەرلێشێواو»، بۆ ئەو چەکدارانەی قاعیدە بەکاردەهێنن کە لەئەفغانستانو عێراق دژی ئەمەریکا دەجەنگن.

جگە لەمەش لەسەرەتای سەرهەڵدانی بیرو بانگەوازی وەهابیدا، گوتاری ئەم بیرە، گرنگیی زۆری بەچەمکی جیهادو جەنگ لەگەڵ خەڵکی بێ بڕوا، دەداو چەندین جەنگو بەرەنگاربونەوەش لەنێوان لەشکری لایەنگری ئەم بیرەو شیعەکانو چەکدارە خێڵەکییەکانیتری عەرەبدا رویداوە، کەچی ئێستا ئەم بیروباوەڕە ئاینییە، تەنها لەنێو دەقو زانستە شەرعییەکاندا کاردەکاتو دورو نزیک خۆی لەقەرەی جیهادو دەسەڵاتو حوکمڕانیو سیاسەت نادات، بەڵکە کاری سەرەکیی بریتییە لە«پاکژکردنەوەی عەقیدەو پاکتاوکردنی بیدعە». تەنانەت گۆڤاری (الاصالە)ی یەک لەزمانحاڵی سەلەفییەکان، رێبازەکەیان بە «بانگەوازێکی هێورو زانستیی دژە بیدعەی دور لەفیتنە» دەناسێنێت.

هەندێک بۆچون، باس لەوەدەکەن، هەڵگەڕانەوەی گریمانکراوی وەهابییەکان لەخەلافەتی عوسمانی، بیدعەیەکی شەرعیو هەڵگەڕانەوەو سەرپێچی نییە. پاساوی ئەم سیناریۆو گریمانەش ئەو بۆچونە فیقهییەیە کە پێی وایە، دەسەڵاتی خەلیفەی پاشین (خەلەف)،

رەهاو قەتعی نییە، بەڵکە وابەستەی شەرعو شوراکردنە، هەرکاتیش خەلیفە تاکڕەوانە مامەڵەی کردو لەشەریعەت لایدا، ئەوە هەڵگەڕانەوە لەدژیو بەرهەڵستکردنی بەچەک، شـــتێکی رەواو دروستە[1]. هەروەها ئەم بۆچونە جەخت دەکاتەوە، لادان لەشەریعەت، شەرعیەتی خەلیفە هەڵدەوەشێنێتەوەو سیفەتی خەلافەتیشی لێ وەردەگرێتەوە، نەک هەر ئەمە بەڵکە بەرەنگاربونەوەی چەکدارانەشی دەکاتە واجبی شەرعی[2]. هەرچەندە مێژوی کردارییانەی سەرەتای سەرهەڵدانی وەهابییەکان، بۆنی پشتڕاستکردنەوەی ئەم بۆچونەی لێدێت، بەڵام وتەکانی خودی محەمەد عەبدولوەهابو نوسینو پێداگرییەکانی لەسەر تەحەممولکردنی پێشەواو فرمانڕەوای ستەمکارو زیادەڕۆ، بەئاراستەیەکیترماندا دەبەنو پشتڕاســتی ئــەم بۆچونە ناکەنەوە. جگە لەمەش تائێســتا هیچ ئاماژەیەک لەنێو بەرهەمو هەڵوێستەکانی، محەمەد عەبدولوەهابدا نییە کە خەلیفەکانی عوسمانی تەکفیر یان بەخراپ وەسف بکات.

بۆچونو گریمانەیەکیتر هەیەو ئاماژە بەوەدەکات، محەمەد عەبدولوەهاب، پێی وابوە، مەڵبەندی بانگەوازەکەی، لەســنوری دەســەڵاتی خەلافەتدا نییە، ئەو جموجوڵەشی ئەو، دەیکات، هیچ دوژمنکارییەکی خەلیفەو فرمانڕەوای ئەوکاتی موسوڵمانان نییە[3]. بەڵگەو پاســاوی ئەم گریمانەیەش واقیعی خراپو داتەپیــوی ئەوکاتی نیوەدورگەی عەرەبو بێدەنگبونو دورەپەرێزگرتنی عوسمانییەکانە لەچارەسەرکردنی.

ســـەرباری ئەم لێکدانەوەو گریمانانەش، جوڵانەوەی چەکدارانەی بزوتنەوەی وەهابی شتێکی نامۆ نییە بەفیکرو مومارەسەی قوتابخانەو بۆچونی گرۆ ئیسلامیەکان، چونکە زۆربەیان، لەگەڵ جیــاوازی بیرکردنەوەو رێبازی کارکردنیاندا، جوڵانەوەو شۆڕشـــی چەکداریـــی بەیەک لەشـــێوازە بنەڕەتییەکانی گۆڕانی سیاســـی دەزانـــن. نێوەڕۆکو ماناکانی جیهادکردنیش، دژ بە جوڵەی چەکدارانە نییە، چونکە جیهاد، لەسادەترینو باوتریـــن مانایدا، «هێنانە کایەو پاراســـتنی ئاینو لابردنی شـــیرکو روبەڕوبونەوەیە لەگەڵ هەر دوژمنو لایەنێکدا کە ئامانجی لادان بێت لەشەریعەت[4]».

لەبری ئەم گریمانکارییو لێکدانەوە دورەدەســـتانە باشترە، بگەڕێینەوە بۆسەر فیکری

---

١. یوسف محمود قرعوش: طرق أنتهاء ولایه الحکام فی الشریعه الاسلامیه ل ٨١ ـ ٨٢

٢. ابن حجر العسقلانی: فتح الباری فی شرح صحیح البخاری، ٧/١٣

٣. عبدالعزیز الرومی وآخرون: مؤلفات الشیخ محمد بن عبدالوهاب، القسم الاول، العقیده ل ٣٤٩

٤. عبدالعزیز عبدالغنی صقر: نظریه الجهاد فی الاسلام، ل ١٤٦ ـ ١٤٧

خودی محەمەد عەبدولوەهابو لەسەرو ئەویشەوە مەرجەعیەتە ئاینییەکەی دەربارەی جیهاد، ئەوکات دەتوانین وێنەیەک لەســـەر پاســـاوەکانی بەرپاکردنی براڤی وەهابی لەسایەی خەلافەتی عوسمانی لەخەیاڵدانی خۆماندا گەڵاڵە بکەین.

محەمــــەد عەبدولوەهاب، پێیوابو، جیهادکردن هەر لەســـەردەمی پێغەمبەرەوە(صلی الله علیه وســلم)، تا رۆژی دوایی‌و لەپشت هەمو پێشەوایەکی دادپەروەرو خراپەکار (فاجر) یشـــەوە، بەردەوام‌و بەرقەرارە، هیچ ســـەدەو ســـەردەم‌و هیچ پاساوو بارودۆخێکیش ناتوانێت جیهادکردن راگرێت[1]. ئیبن تەیمیە کە یەکێکە لەگەورە بیرمەندو رێبەرەکانی بیری سەلەفییەت، پێدادەگرێت، لەسەر ئەوەی، «گەر موسوڵمانان، دوچاری دۆخێکی دژواربونەوەو کەوتنە نێو فیتنەوە، ئەوا پێویست دەکات، کەسێکی شیاو لەنێو خۆیاندا دەستنیشـــان بکەن، ببنە یاریـــدەدەرو کۆمـــەککاری لەجێبەجێکردنی ئەحکامەکانی شـــەریعەتداو جیهادی لەدواوە بکەن»[2]. ئەم دۆخە دژوارو سەردەمە پڕ لەفیتنەیەش کـــە ئیبن تەیمیە هێمای بۆدەکات، بـــەلای ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەلەوە کاتێکە کە «پێشـــەوایەکی بەهێز بۆ هەڵسوڕاندنی کاروباری موســـوڵمانان، لەگۆڕەپانەکەدا نەبێت[3]».

هەرچەندە وەک زۆرێک لەبیرکردنەوە، ئیســـلامییەکانیتر، بەلای ســـەلەفییەکانەوە، جیهادکردن، ترۆپکی ئیسلامەتییە، بەڵام بەبێ بونی ئیمام‌و پێشەواو بەبێ جیابونەوەی بەرەی کوفرو بەرەی ئیمان‌و بەبێ بونی تواناو لێهاتویی ماددی‌و مەعنەوی بەرپاناکرێت. بەبڕوای سەلەفییەکان، هەرکات، مەرجەکانی جیهاد، نەهاتنەدی ئەوە، بەرەنگاربونەوە چەکدارییەکـــە دەبێتـــە جەنگ (قتـــال)و نابێتە جیهاد، چونکە لەشـــەریعەتدا تەنها بەجەنگـــی دژە کافرو بێبـــاوەڕان، دەوترێت جیهاد[4]. ئەم خاڵـــەش یەکێکە لەهێڵە جیاکەرەوەکانی تێگەشتنی «سەلەفیانەی وەهابی» لەگەڵ تێگەشتنی «سەلەفیانەی جیهادیی»، کە زۆرێکیان، لولەی چەکەکانیان ئاراستەی کۆمەڵگا موسوڵمانەکانەکان دەکەن‌و بەنـــاوی جیهادکردنەوە، لەنێو ئاپۆڕای خەڵکی موسوڵمانیشـــدا تەقینەوەو کوشتاری بەکۆمەڵ ئەنجامدەدەن.

---

١. عبدالعزيز الرومي وآخرون: مؤلفات الشيخ محمد بن عبدالوهاب، الرسائل الشخصيه، ل ١١

٢. مجموعه الفتاوى، ٣٥/ ١٨٨

٣. عبدالله بن سحمان الاحمدى: المسائل والرسائل المرويه عن الامام أحمد فى العقيده، ٤/٢

٤. عثمان بن معلم محمود: موقف المسلم من القتال فى الفتن، ل ٣٥ ـ ٤٠

ســـەبارەت بەو پرسیارانەشی لەسەر هێرشو لەشکرکێشـــی وەهابییەکانی نەجد، دژ بە میرنشـــینو چەکدارە خێڵەکییەکانیتری نیوە دورگەی عەرەب لەئارادان، رشـــتەی مێژوییو ئەو گێڕانەوانەی کە تائێستا لەبەردەستدان، دەمانخەنە سەر ئەو بۆچونەی، گوێ نەگرتنو ملنەدانی دەوروبەر، بۆ بانگەوازی سەلەفییەتو حوکمدانی شیرک بەسەر ئەو پەرستشانەی پەیڕەویاندەکرد، وەهابییەکانی پەلکێشکردوە، بۆئەوەی هێز لەدژیان بەکاربهێنن، چونکە بەلای بیری سەلەفییەوە لەم جیهانەدا هیچ تاوانوخراپەیەک وەک شـــیرکو پەنابردن بـــۆ غەیری خودا، بەڵای بێئامان نییـــە، ئەوەتا خودا فەرمویەتی «وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْـــرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِـــرِينَ» الزمر: ٦٥ واتە: ئێمە بەتۆو بەوانەشـــی بەر لەتۆبون، رامانگەیاند، هەر کەسیتر بکەیتە شەریکی خودا، بێگومان کارەکانت پوچەڵ دەبێو لەریزی زیان لێکەوتوانی. هەروەها «إِنَّ اللَّهَ لا يَغْفِـــرُ أَنْ يُشْـــرَكَ بِـــهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَـــاءُ وَمَنْ يُشْـــرِكْ بِاللَّهِ فَقَـــدِ افْتَرَى إِثْمًا عَظِيمًا». واتە: خوا لەوانە خۆش نابێت، بێژن هاوکاری هەیە. جگە لەمە هەرکە خوا مەیلی لێ بێ لێی دەبورێ. «إِنَّهُ مَنْ يُشْـــرِكْ بِاللَّهِ فَقَـــدْ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيهِ الْجَنَّةَ وَمَأْوَاهُ النَّارُ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ» المائدة: ٧٢ واتە: هەر کەسێ شەریک بۆ خوا پەیدا بکات، خوا بەشی لەبەهەشت دەبڕێ.

دەگێڕنەوە، کابرایەک لە محەمەد عەبدولوەهابی پرســـیوە، چۆن ئەم یەکتاپەرستیو تەوحیدە جێبەجێو بڵاوبکەینـــەوە؟، ئەویش وتویەتی «بەئامۆژگاریکردنو بانگەوازو فرمـــان بەچاکەو نەهی لەخراپە، ئەگەریش جێبەجێنەکرا، هێز بەکاردەهێنین، چونکە ئـــەوەی بـــڕوای بە تاقانەیی خودا نەبێت لەپەرســـتندا کافرە[١]». ئـــەم گێڕانەوەیە ـ ئەگەر راســـت بێت ـ لەگەڵ کۆی کارنامەی بزوتنەوەی وەهابیدا، نیشـــاندەری ئەوەیە لەفیکری سەلەفیدا، بەکارهێنانی رێگاچارەی بانگەوازو فرمان بەچاکەو نەهی لەخراپە، لەپێشـــترە، ئەگەریـــش بانگەوازکردن بەرهەمی نەبو، مەرجەکانـــی جیهادکردنیش ـ لەجیابونـــەوەی بەرەی کوفرو ئیمـــان، بونی تواناو لێهاتویی، بونی پێشـــەوا ـ ئەوا جیهادکـــردنو جموجوڵی چەکداری رەواو دروســـتە. بەڵام ئەمە بـــەو مانایە نایەت، لەژێرناوی چەســـپاندنی یەکتاپەرستی خودا، خەڵک خێرا دەست بدەنە چەکو دەست بکەن بەکوشتو کوشتار، چونکە دیســـانەوە محەمەد عەبدولوەهاب، لەیەکێک لەوتە بەناوبانگەکانیدا، زیاتر بنەمای تەکفیرو جیهادکردن روندەکاتەوەو دەڵێت «لەکاتێکدا ئێمە ئەوکەســـانە بەکافر دانانێین کە لەسەر ئارامگای عەبدولقادری گەیلانیو ئەحمەد

---

١ـ د. عبدالمنعم الحنفی: موسوعه الفرق والجماعات....، ل ٦٨٣

بەدەوەی گۆڕ دەپەرستنو نازانن کارێکی خراپ دەکەن، کەسیش نییە بۆیان رون بکاتەوە، ئیتر چۆن ئەوانە بەکافر لەقەڵەم دەدەین، کە هاوەڵ بۆ خودا بڕیاردەدەنو ئامادەنین کۆچ بکەنو بێنە نێو بانگەوازی ئێمە، ئەمە بوهتانێکی گەورەیە بەدەممانەوە دەکرێتو پەنادەگرین بەخودا لێی»[1].

ئەم وتەیەی محەمەد عەبدولوەهاب، جەخت لەسەر پێویستیی بانگەوازکردنو ئەوەی لەئەدەبیاتی شەریعەتدا پێی دەوترێت (اقامه الحجه)، دەکاتەوە، دواتر موسوڵمانان دەخاتە سەر رێگای بیرکردنەوە لەگرتنەبەری رێگاچارەی بەکارهێنانی هێزو هەنگاویتر. هەروەها رێبەرەکانیتری ئەمدواییەی بیری سەلەفی، ئاماژەیان بەوەکردوە، دەرگای جیهاد، کاتێک والآدەبێتو دەکەوێتە سەرپشت کە لەمپەرو ئاستەنگ لەبەردەم بانگەوازکردندا، بۆ یەکتاپەرستیو رێگای خودا، هەبێت. یان مەترسی گەورە لەسەر یەکتاپەرستی لەئارادابێت[2]. هەندێک لەسەرچاوە مێژووییەکانیش، ئاماژەیان بەوەکردوە، ئۆباڵی هەمو لەشکرکێشیو هەڵمەتەکانی سوپای نەجدو لەشکری ئال سعود لەئەستۆی بیری سەلەفیەتی محەمەد عەبدولوەهابدا نییە، چونکە بەشێک لەو هێرشو کێشمەکێشانەی سەدەی ١٨ ی نیوەدورگەی عەرەب، لەسەر دەسەڵاتو فراوانکردنی نفوز، رویانداوەو پەیوەندییان بەئاینەوە نەبوە. جگە لەمەش، لەشکرو سوپای نەجد، لەجەنگاوەرانی خێڵە عەرەبییەکان پێکدەهات، ژمارەیەکی زۆر کەمیشیان شارەزای زانستە شەرعییەکان بونو هەندێکجار پەرچەکردارو هەڵسوکەوتی توندڕەوانەیان زادەو دەرهاویشتەی سروشتی خێڵەکیانەی خۆیانو واقیعی ئەوکاتی کۆمەڵگاکانیان بوە[3].

١. حسین بن غنائم الاحسائی: روضه الافکار والافهام، تحقیق د. ناصرالدین الاسد، ل ٤٩٧. وەرگیراو لە ابو مسعود الندوی: محمد بن عبدالوهاب، ل ٧٨.

٢. محمد بن جمیل زینو: العقیده الاسلامیه فی چوو الکتاب والسنه ل ٨٢

٣. بڕوانە: لونکریك: أربعه قرون من تأریخ العراق الحدیث، ل ٢٢٧. ٢٣٠

# سەلەفیەتو تەکفیر

بەدرێژایی مێژوی ســـەرهەڵدانو گەشـــەکردنی، تۆمەتی تەکفیرو توندڕەوەی بەدوای تەوژمی ســـەلەفیەتو وەهابییەوەبوە. دوای روداوە گـــەرمو گرنگەکانی ئەمدواییەی جیهانو رۆژهەڵاتی ناوەڕاســـتیش لەهاتنی سوپای ئەمەریکا بۆ نیوەدورگەی عەرەبو روداوەکانی ١١ ئەیلولی نیویۆرکو واشنتۆن، تۆمەتی تیرۆریش بۆ سەر تۆمەتەکانیتری سەر بانگەوازی سەلەفیانەی وەهابی زیادکرا.

هەڵوێســـتەکردن لەراستو دروستیو ئەم ناســـاندنو تۆمەتبارکردنەی وەهابییەکان، پێویست بەشەنو کەوکردنی رابرودوو ئێستای بزوتنەوەو بانگەوازەکە دەکات، چونکە ئەم تێڕوانینە ئاینییە، جیا لەناوەڕۆکە فیکرییەکەی زیاتر لەدوو سەدەیە لەسعودیەدا بەکرداریی بنەماکانی جێبەجێدەکرێت.

وەک ئاماژەمانپێکرد، محەمەد عەبدولوەهاب، نەزانینو تێنەگەشتنی خەڵکی لەپەیامی یەکتاپەرستی کردۆتە پاساو بۆ ئەوەی تەکفیر نەکرێن. لەماوەی ژیانی خۆشیدا چوار خەلیفەی عوســـمانی بەرێکردوە، بێئەوەی تەکفیرو تەنانەت قســـەیەکی خراپیشیان ئاراستەبکاتو لەبەرهەمەکانیدا تۆماری بکات. لەدوای مەرگی محەمەد عەبدولوەهابو رمانـــی خەلافەتـــی عوسمانیشـــەوە، چەندین حیـــزبو بیروباوەڕی نوێی ئیســـلامی سەریانهەڵدا کە بەو پاساوەی لەسایەی خەلافەتدا ناژینو حوکمی شەریعەت جێبەجێ ناکـــەن، دەوڵەتە عەلمانییەکانیان بەکافر دەزانیو کۆمەڵگا ئیسلامییەکانیشـــیان بە (دار الکفر) لەقەڵەمدەدا. سەید قوتب، کە یەک لەدیارترین بیرمەندەکانی رابونی نوێی ئیسلامییە دروشمی «جاهیلیەتی سەدەی بیستەم»ی بەرزکردبۆوەو پێداگری لەسەر ئەوە دەکرد، «جیهانی ئیسلامو کۆمەڵگاکانی گەڕاونەتەوە بۆ تافی نەزانیو جەهل، چونکە لەســـایەی خەلافەتدا ناژین». لەم میانەیەشدا ســـەلەفییەکان بەتوندی دژی ئەم پۆلینو وەسفکردنەی دۆخی دوای روخانی خەلافەت، دەوەستنەوەو بەپێچەوانەی ئەم تەرزە بیرکردنەوەوە، بەچڕوپڕی جەخت لەســـەر خەتەرناکیی دیاردەی تەکفیر، دەکەنەوە.

بەبۆچونی ســـەلەفییەکان، تەکفیری حازربەدەستی ئەلقاعیدەو گروپە ئیسلامییە خۆ بەســـەلەفی زانەکانیتری جیهانی ئیسلام، بەشێکە لەپاشـــماوەکانی بیری خەواریجە

توندڕەوەکان [1]. هەروەها بەڕای ســـەرنماکانی ئێستای سەلەفییەت، زیادەڕۆییکردنی هەندێک لایەن، لەکافرکردنی بەرانبەردا، ئاکاری ئەهلی بیدعەو خەڵکی نەشـــارەزایە بەجەوهەری ئیســـلام، چونکە سیفەتی کوفرو شـــیرکی هەندێک کردارو گوفتاری نێو موسوڵمانان، ناکاتە کافربونی خاوەنو ئەنجامدەرەکانیان.. کەس بەئەنجامدانی کاری کوفرو شیرک نابێتە کافرو موشریک، ئەگەر بیروباوەڕی گۆڕانی بەسەردانەیەتو کوفرو شیرکەکە بەرەوا نەزانێت[2].

بیروبـــاوەڕی ســـەلەفییەت، جیاوازی دەخاتـــە نێوان «کوفری بیروبـــاوەڕ» لەگەڵ «کوفری کردار»، بەم پێیە ئەنجامدانی کوفر، بەنەزانی یان بەهەڵە، کوفری بچوکە، هەروەهـــا ئەنجامدانی ئەوانەی لەقورئانو فەرمودەدا بەکوفر نابراون وەک: کوشـــتنی موسوڵمان، نوێژنەکردن، سوێندخواردن بە غەیری خوداو.......هتد. تاوانی گەورەن، بـــەڵام ئەنجامدەرو خاوەنەکانیان لەبازنەی ئیســـلام دەرناکەنو ئەنجامدەرەکانی هەر بەموســـوڵمانەتی دەمێننەوە[3]. هەرەوەها شـــێخ محەمەد ناسرەلدین ئەلبانی کە یەک لەگەورەتریـــن رێبەرە هاوچەرخەکانی ســـەلەفییەتە، لەیەکێک لەوتارە دەنگییەکانیدا کە بەکاســـێت تۆمارکراوە، جەختدەکاتەوە، ١٤ سەدەش لەدوای هاتنی پێغەمبەر(صلی الله علیه وســـلم)، رەنگە کەســـانێک هەبـــن لەئەوروپاو لەقوتەبکانی باکورو باشـــور کە گوێبیســـتی پەیامی ئیسلام نەبوبن، ئەمەش بەسە بۆ ئەوەی تەکفیر نەکرێن. ناوبراو کە فەرمودەناســـێکی بەناوبانگە جەخت دەکاتەوە، «ئەوانەی بانگەوازی ئیسلامییان وەک پێویســـتو لەسەر شێوەی راستو دروست پێنەگەشـــتوە، لەپاشەڕۆژدا خودا، حسابی تایبەتەیان لەگەڵدا دەکات، ئەمەش لەچەندین فەرمودەدا ئاماژەی پێکراوە». هەروەهـــا دەڵێت «رەنگە کاتێک بانگەوازی ئیســـلامی بگاتە هەندێک کۆمەڵو گروپ کە هەندێکیان ئەوەندە پیرو پەککەوتەبن کە باش شتەکان تێنەگەن، منداڵەکانیشیان پێگەشتو نەبن، ئەمەش خودا لەرۆژی دواییدا مامەڵەیەکی تایبەتیان لەگەڵدا دەکات». ناوبـــراو، لەو زنجیرە کاســـێتەدا کـــە دواتر یەکێک لەخوێندکارەکانـــی بەناوی عەمر عەبدولمونعیـــم، لەدوتوێی کتێبێکدا بەناوی (الســـلفیه) بڵاویکردەوە، بۆ حوکمدانی

---

١ـ موسى بن عبدالله آل عبدالعزيز: اضواو على دعوه محمد بن عبدالوهاب، مجله السلفيه العدد ٢، الرياض ١٤١٧ ه، ل ٩٠ ـ ٩٨

٢ـ د. عبدالمجيد بن سالم عبدالله المشعبى: منهج ابن تيميه فى مسأله التكفير، ل ٥٥

٣ـ د. صالح بن فوزان عبدالله الفوزان: كتاب التوحيد، ل ٢٠ ـ ٢٢

تەکفیرو دیاریکردنی چارەنوسـی پاشـەرۆژی خەڵکو کۆمەڵگاکان، ئەوەی بەمەرج گرتوە، کە بانگەوازی راسـتو دروستی ئیسـلامیان بەرێکوپێکیو بەجوانترین شێوە پێگەشتبێتو رەتیانکردبێتەوە، نەک تەنها دورەو دور گوێبیستی هەندێ زانیاری پچڕ پچڕ بوبن دەربارەی ئیسلام.

بەڕای سـەلەفییەکان، تەکفیرکردن مافێکی تایبەتـی خودایە، هیچ کۆمەڵو گروپو دەستەیەک بۆی نییە لەبەر بەرژەوەندی خۆی بەکاری بهێنێت. ئەسڵ وەهایە سەرجەمی موسـوڵمانان راساڵو دادپەروەربنو بەبەڵگەی زۆر رونی شەرعیی نەبێت، کەس بۆی نییـە کافریان بـکات، چونکە تەکفیری ناڕەوا هەم درۆکردنـە بەناوی خوداوەو هەم کەوتنە نێو حاڵەتێکیشە کە خوداو پێغەمبەر سەرکۆنەی دەکەنو پێی رازی نین[1].

سـەلەفییەکان هێندە خۆیان، لەدیاردەی تەکفیرکـردن بەدوردەگرن، تەنانەت، ئەو پەرلەمانو دادگایانەش بەکافر نازانن کە یاساو رێسای نائیسلامیو خۆرئاوایی گەڵاڵە دەکـەن، لەراڤەکردنی ئەو ئایەتەشـی کە دەفەرموێت «ومن لـم یحکم بما انزل الله فاولئک هم الکافرون» التوبە ـ پشتگیری لەو بۆچونە دەکەن کە دەڵێت «ئەو دادوەرو پەرلەمانتارو یاسـادانەرانە کافرن، کە دەستورو یاسا نائیسـلامیو دەستکردەکان، بەشـیاوترو پەسـەندتر دەزانن تا یاسـای ئیسـلام». واتە ئەگەر یاسـادانەرانو جێبەجێکەرانیشـی پێیان وابو، یاسای ئیسلام باشترو کاملترە، بەڵام لەژێر گوشارو لەبەر بەرژوەندی جۆراوجۆر، پەنایان بردە بەر یاسـای نائیسلامیو دەستکرد، ئەوە پێـی کافر نابنو ناچنە ژێر حوکمی «فاولئک هم الکافرون»ی ئایەتەکەی قورئانەوە، بەڵکە لەو حاڵەتەدا کوفرێکی بچوکو تاوانێکی گەورەیان ئەنجامداوەو بەشـێوەیەکی گشتی هەر موسوڵمانن[2].

زاناو ناودارەکانی بیری سەلەفییەتی نوێ، دیاردەی تەکفیر بە «بەڵاو فیتنەی حیزبە جیهادییە ئیسـلامییەکان»، لەقەڵەم دەدەن. لەنەوەدەکانی سـەدەی رابردوشـدا، هەریەک لە عەبدولعەزیز بن بازی موفتی پێشـوی سـعودیەو، شێخی فەرمودەناس، محەمـەد ناسـرەلدین ئەلبانی، گەورە رێبەرانـی بیری سـەلەفییەت، لەدو فەتوای هاوشـێوەدا جەختیان لەسـەر ئەوەکردەوە، «نابێت لەسەر تاوانکردنو خراپەکردن، کەس کافـر بکرێت». ئەم دو موفتییەی سـەلەفییەکان بەتوندی، بۆچونی کۆمەڵە

١ـ خالد بن علی بن محمد العنبری: الحکم بغیر ما أنزل الله وأصول التکفیر، ل ٣٠ ـ ٣١

٢ـ سفر بن عبدالرحمن الحوالی: شرح رساله تحکیم القوانین لمحمد بن أبراهیم آل الشیخ، ل ٣٣ ـ ٣٥

جیهادییەکانــی جەزائیــرو وڵاتانیتری جیهانی ئیســلامییان لەبــارەی تەکفیرکردنی فرمانڕەواو کۆمەڵگاکانەوە رەتکردەوەو بە بۆچونێکی «دور لەســوننەتو شەریعەتی دروست» دایانەقەڵەم[1].

لەدوای کارەســاتەکانی ١١ ئەیلولی ٢٠٠١ ی ئەمەریکاو روخانی دەســەڵاتی تاڵیبانی ئەفغانســتانو رژێمی ســەدامەوە لەعێــراق، ژمارەیەکی زۆر لەگەنجانی ســعودیەو وڵاتانیتری عەرەب، بۆ بەرەنگاربونەوەی سوپای ئەمەریکا، پەیوەندیانکرد بەرێکخراوی ئەلقاعیدەی ئوســامە بن لادنەوە. لەم بەروارەشەوە، تێکڕای گوتاری سەلەفییەکانی سعودیەو ئوردنو عێراقیش لەدەوری خستنەڕوی مەترسییەکانی تەکفیرو حەرامکردنی تەقینەوەو کاری خۆکوژی چڕبۆتەوە. لەئەدەبیاتی وەهابییە سەلەفییەکاندا، ئەلقاعیدە گروپێکی «ضال»و سەرلێشــێواوەو شوێنکەوتوانیشــی هەڵخەڵەتێنراونو کردە خۆ کوژییەکانیشیان حەرامو سنوربەزاندنی شەریعەتن. شێخ ساڵح ئەلفەوزان، کە ئەندامی دەســتەی گەورە زانایانی ســعودیەو ئەندامی لیژنەی فەتوای ئــەم وڵاتەو رێبەرێکی ناسراوی سەلەفییەکانە، لەوتارێکدا، بەناونیشانی «مەرجو بەندوباوەکانی جیهاد» کە لەشاری ریاز، پێشکەشــی کردوەو لەژمارەی رۆژی ٢٠٠٩/٤/٢٠ی رۆژنامەی (القدس العربی) هەندێکی بڵاوکراوەتەوە دەڵێت «ئەوەی رێکخراوی ئەلقاعیدە دەیکات، جیهاد نییە. ئەوەشــی خەڵکانێکی خۆ حەشــارداو لەپاکســتان دەیکەن، هەر جیهاد نییە، چونکە لەژێر هیچ ئاڵایەکدا ناکرێت، بەڵکە فەوزاو کوشــتو بڕێکە کە زیانی قورسو کوشــندەی زۆری لێکەوتۆتەوە». ئەلفەوزان، دەڵێت «خۆکوژەکان ستەم لەخۆیانو لەموسوڵمانان دەکەن. ئەوان، بەکوشتنی خەڵکی مەدەنیو ئەو دیبلۆماسە بیانییانەی کــە مۆڵەتی کارکردنیان لەم وڵاتانە هەیە، کارێکــی خراپ دەکەن». لەهەمان کاتدا ناوبراو دەڵێت «شــەرمو شــکۆ لەجیهاددا نییە.. خودا شــەرعیەتی داوە بەجیهادو ئەوەتا لەکۆلێــژو پەیمانگاکاندا دەخوێنرێتو نەتەوە یەکگرتوەکانو کەســانیتریش، ناتوانن هەڵی بوەشێننەوە، بەڵام جیهاد مەرجو بەندو باوی خۆی هەیە». لەدیدارێکی کەناڵی BBC دا لەرۆژی ٢٠٠٩/٥/٤، ئیمامی حەرەمی مەککی، شێخ عادل کەلەبانی، رونیکردەوە، پاش گفتوگۆیەکی دورودرێژ لەگەڵ شــێخ محەمەد ســاڵح عوسەیمینی ئەندامی دەســتەی گەورە زانایانی سعودیە، کە بەرلەچەند ساڵێک کۆچی دواییکرد، گەشتونەتە ئەو بڕوایەی حوکمی خۆتەقاندنەوە، بەپاساوی جیهادو موقاوەمە، هەمان

١. دەقی هەردو فەتواکە لەژمارە ٣ی گۆڤاری (السلفیە)، بڵاوکراوەتەوە، لەساڵی ١٤٠٧ کۆچی کە (دار البحوث والدراسات المعاصرە والتراجم) لەریازی پایتەختی سعودیە دەریدەکات

حوکمی خۆکوشـــتن (الانتحار) ی هەیەو دەڵێت «هەمو کەسیش دەزانێت لەئیسلامدا ، خۆکوشـــتن حەرامو یاســـاغە» . دیارترینو بەناوبانگترین زانا سەلەفییەکانی وڵاتی شـــامو نیوە دورگەی عەرەبیش، لەزنجیرەیەک فەتـــواو رونکردنەوەدا، تەقینەوەکانی شـــاری خوبەری سعودی کە بوبەهۆی کوژرانی ١٩ سەربازی ئەمەریکاو تەقینەوەکانی ١١ ئەیلولـــی ئەمەریـــکاو رفاندنـــی گەشـــتیارانی بیانییان لەوڵاتە ئیســـلامییەکان، بەناشـــەرعیو ناڕەوا وەســـفکرد. ئەم رێبەرانەی ســـەلەفییەت، بەکارهێنانی تیرۆرو تەســـفییەی جەســـتەییو ترســـاندنی خەڵک لەرێگای توندوتیژییـــەوە، بۆ گەیاندنی ئیســـلام رەتدەکەنەوە، هەروەها توندوتیژیی ئیســـلامییە چەکدارەکانیش لەکۆمەڵگا موسوڵمانەکاندا، بەعاتیفەو حەماسەتی بێهودەو پوچ لەقەڵەم دەدەن.

# سەلەفییەتو دەسەڵات

محەمەد عەبدولوەهاب، بۆچونی وەهایە، بونی پێشـــەوایەک (امام) کە ئەحکامەکانی شەریعەت، پیادەو پەیڕەوبکات.. ریزەکانی موسوڵمانان رێکبخاتو بۆ بەرەنگاربونەوەی دوژمن، کۆیان بکاتەوە، پێویســـتییەکی هەنوکەییو شەرعیی کاروانی بانگەوازو کاری ئیســـلامییە. ئەم بۆچونەش لەگەڵ بۆچونی زۆرێک لەقوتابخانە ئیســـلامییەکانیتردا رێکو تەبایە[1].

ئەو پێشـــەواو ئیمامەش کە ســـەلەفییەکانو دەســـتەو گرۆ ئیســـلامییەکانیتر داوای دەستنیشـــانکردنی دەکەن، لەئەدەبیاتی فیقهی ئیســـلامیدا بەخەلافەت، گوزارشتی لێدەکرێتو بریتییە لە: سەرکردایەتیکردنی گشت موسوڵمانان بەئامانجی جێبەجێکردنی ئەحکامی شەریعەتی ئیسلامیو گەیاندنی بانگەوازی ئیسلام بەهەمو جیهان[2]. زۆربەی زۆری بۆچونە ئیســـلامییەکانیش لەسەر ئەوە رێکو یەکدەنگن، کە دەستنیشانکردنی ئیمامو خەلیفە فەرزێکی ئایینیو واجبێکی شـــەرعیی سەرشـــانی موسوڵمانانەو هیچ جیاوازییەکـــی لەگـــەڵ فەرزەکانیتردا نییە[3]. نەک هەر ئەمە بەڵکە، فەرامۆشـــکردنو خەمســـاردی بەرامبـــەر دیاریکردنـــی خەلیفـــە، تاوانێکی گەورەیـــە، چونکە زۆرێک لەحوکمەکانی ئیسلام لەســـەر بونو بەرقەراربونی خەلافەت بنەڕەتن[4]. تائێستا جگە لەهەندێک شەرعزانی سەر بەگروپی عەقڵانیی موعتەزیلە کەسیتر لاریی لەم حوکمانەی سەرەوەنییە[5]، بگرە، ئیبن تەیمیەی گەورە مامۆستای سەلەفییەت، پێدادەگرێت لەسەر ئەوەی «دین بەبێ خەلافەتو پێشەوا، بەرقەرار نابێت»[6].

ئەگەر ئەم بنەماو حوکمە فیقهیانەی ئیسلام بەسەر کارنامەی وەهابییەکاندا جێبەجێ بکەین، دەردەکەوێت، گەڕانـــی محەمەد عەبدولوەهاب، بەدوای میرێکدا بۆ مۆرکردنی

---

١. د. عبدالسلام بن برجس العبدالكريم: معامله الحكام فى ضوء الكتاب والسنه، ل٦١

٢. تقى الدين النبهانى: نظام الحكم فى الاسلام، ل ٣٢

٣. د. عبدالسلام بن برجس العبدالكريم: معامله الحكام، ل ٦١

٤. تقى الدين النبهانى: نظام الحكم فى الاسلام، ل ٣٦

٥. أبى الحسن على بن محمد حبيب الماوردى: الاحكام السلطانيه، ل٥٦ وەرگیراو لەمعامله الحكام

٦. عبدالمنعم مصطفى حليمه: الطريق ألى استئناف حياه اسلاميه، ل٨

هاوپەیمانێتی لەگەڵیداو دورکەوتنەوەی خۆی لەکاروباری سیاســەت، گەڕانە بەدوای ئەو پێشــەوایەی «بەبێ ئەو، دین بەرقــەرار نابێت». محەمەد عەبدولوەهاب، لەگەڵ ئەوەی خۆی رێنماو رێبەری ئاینیو رۆحیی سەلەفییەکان بو، بەرپرسیارێتی سیاسیو ئیداریی بانگەوازو میرنشــینی درعیەی نەگرتەدەســتو خۆی وەک ئیمام نەناساند، بەڵکــە لە ســاڵی ١٧٧٤ زاینــی، بەیعەتی دا بەمحەمەد بن ســعودی میری درعیەو لەگەڵیدا رێککەوت، خۆی موفتیو پیاوی ئاینیو ئال ســعود، فرمانڕەواو کاربەدەست بن. لەفیقهی ئیسلامییشدا بەیعەتدان، شەرعیەت، دەبەخشێتە فرمانڕەواو پابەندبونە بەکۆمەڵی موسوڵمانانو گوێڕایەڵیکردنی پێشەوا دیاریکراوەکەیانە[1].

گرفتی ئەم لێکدانەوەی سەرەوەش، ناوچەیی بونو بچوکی دەسەڵاتو ناوبانگی محەمەد بن ســعودە، لەچاو خەلیفەیەکی باڵادەســتی وەک عوســمانی کە لەمپەڕی جیهانی ئیســلامەوە تا ئەوپەڕ، حوکمی دەکرد. بەڵام راســتییەکی گرنگ هەیەو وەڵامی ئەم پرسیارەمان دەداتەوە، ئەویش بیری سیاسی سەلەفییەکان خۆیانە، کە زاناکانی زیاتر لەجارێک باسیانکردوەو رونیانکردۆتەوە ئەویش: «بونی چەند ئیمامو فرمانڕەوایەکی موسوڵمان لەیەک کاتو سەردەمدا شتێکی ئاساییو رەوایە».

پاســاوی سەلەفییەکان بۆ فرە ئیمامی، رێسایەکی شەرعزانییە کە دەڵێت «جیاوازی نەکردن لەنێوان حاڵەتی ئاساییو ناچاریدا، نەشارەزاییە لەعەقڵو نەقڵ[2]». هەر لەژێر رۆشنایی ئەم رێسایەشدا محەمەد عەبدولوەهاب، دەڵێت «پێشەوای هەمو ئاینزاکانی ئیسلام، لەسەر ئەوە کۆکن، گەر کەسێک بەسەر وڵاتێک یان چەند وڵاتێکدا باڵادەست بــو، ئەوە هەمــو مافێکی ئیمامی هەیە، گەر وانەبێت، ئــەوە کاروبار بەرێوەناچێت. خەڵک لەســەردەمی ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەلەوە، تائێســتا لەسەر خەلافەتی تاکەکەســێک هاوڕاو یەک دەنگ نەبون. هیچ پێشەوایەکی ئیسلامیش جێبەجێکردنی ئەحکامەکانی شــەریعەتی بەبونی پێشــەوای مەزن (الامام الاعظم) ەوە، پەیوەست نەکردوە». ئیبن تەیمیە دەڵێت «سوننەت وایە، موسوڵمانان یەک پێشەوایان هەبێتو ئەوانیتر بریکارو نوێنەری ئەو پێشەوایەبن. بەڵام گەر ئەمە لەسەر زەوی بەدینەهاتو چەند ئیمامو خەلیفەیەک راســتبونەوە، ئەو دەمە، هەر یەکەیان بۆخۆی حوکمو سزا

١. أحمد صدیق عبدالرحمن: البیعە فی النظام السیاسی الاسلامی، ل ٣٥

٢. ابن الوزیر: العواصم من القواصم فی الذب عن ســـنە ابی القاســـم، ل ١٧٤ وەرگیراو لە معاملە الحکام، ل ١٨٢

جێبەجێ دەكات»[1].

بەم پێیەو بەبۆچونی سەلەفییەكان، دەكرێتو ئاساییە، لەهەمو وڵاتو میرنشینێكدا، هاوتاو هاوشـــێوەی خەلیفەیـــەك هەبێتو لەســـەر خەڵكی ئەو وڵاتەش پێویســـتە گوێڕایەڵی بكەن. بۆ پشتڕاســـتكردنەوەی ئەم بۆچونـــە فیقهییەش، نمونە بەمێژوی ئیســـلام دەهێننەوە، كە لەدوای سەردەمی حوكمڕانی ئومەوییەكان (٤١ ـ ١٣٢ ك)، جیهانی ئیســـلامیی دابەش بو بۆچەند میرنشـــینو دەسەڵاتێكی جیاجیاو پەرتەوازە، تارۆژگاری ئەمڕۆش، موسوڵمانان لەسەر بەیعەتی تاقە خەلیفەیەك یەك دەنگو یەك هەڵوێست نەبون.

گەڵاڵەكردنی چەمكی فرە خەلیفەیی، لەلایەن ســـەلەفییەكانەوە، جیاوازیو ناكۆكیی هەیـــە لەگەڵ رای ئاینزاو قوتابخانە ئیســـلامییەكانیتر، كـــە جەختدەكەنەوە «بونی زیاتر لەیەك خەلیفە لەیەك ســـەردەمدا شـــتێكی ناڕەواو ناشـــەرعییە». بەبۆچونی ســـەلەفییەكان، گوێڕایەڵیكردنی خەلیفەكان، فەرزو بنەمایەكی بنەڕەتیی شەریعەتی ئیســـلامە، چونكە ئاین بەبێ كۆمـــەڵو بزاڤ، جێبەجێو پەیـــڕەو ناكرێت، كۆمەڵو بزاڤیش بەبێ پێشـــەواو رابـــەر بەڕێوەناچێت، بەبـــێ گوێڕایەڵیكردنیش، فرمانڕەواو پێشەوا، ئیدارەی كاروباری كۆمەڵگایان بۆ ناكرێت[2].

ســـەلەفییەكان هێندە پابەنـــدن بەخەلیفەو دەســـەڵاتداری موســـوڵمانەوە، زۆرجار بەپاشـــكۆی دەســـەڵاتو خەمســـاردو كەمتەرخـــەم بەرانبەر ســـتەمی دەســـەڵات، تۆمەتباردەكرێن. هۆكاری ئەمەش بۆ ئەوەدەگەڕێتەوە، لەبیروباوەڕی ســـەلەفییەتدا، دەرچـــونو هەڵگەڕانەوە لەفرمانڕەوای ســـتەمكاریش ناشـــەرعیو ناڕەوایە، چ جای دەسەڵاتی خزمەتگوزارو دادگەر[3].

شەرعزانە ســـەلەفییەكان، رێگا بە رەخنەگرتنی ئاشـــكرا لەدەسەڵات نادەنو پێیان شـــەرعیی نییە، هیچ كەس لەسەر مینبەرو لەشـــوێنی گشتیو لەمیدیاكاندا بەزەقیو ئاشـــكرا كەموكوڕییەكانی دەســـەڵاتی باش، باس بكاتو پێیان وایە روبەڕوبونەوەی دەســـەڵات بەمشـــێوەیەو كەنارخســـتنی ئامۆژگاری نهێنی، دەبێتە هۆی دروستبونی

---

١. مجموعه الفتاوی، ١٧٥/٣٥

٢. د. عبدالسلام بن برجس العبد الكریم: معامله الحكام، ل٧

٣. بڕوانە عبدالعزیز عبدالله بن باز: المعلوم من واجب العلاقه بین الحاكم والمحكوم، ل ٢٢ ـ ٢٣

پاشــگەردانیو گۆبەن[1]. هەرچەنــدە هەندێک لایەن ئەم بۆچونانەی ســەلەفییەکان بەخزمەتکردنی بەرژەوەندی دەسەڵاتی پادشایانەی بنەماڵەی ئال سعود، لێکدەدەنەوەو پێیــان وایــە ئەم بۆچونــە، هێندە پاراســتنی دەســەڵاتی ئال ســعودو دەوڵەتی ســعودیی مەبەستە، ئەوەندە پاساوی شــەرعیانەی لەپشت نییە، بەڵام وەک زۆرێک لەشتەکانیتریان ســەلەفییەکان، بەڵگە بەژیاننامەو ماجەرای ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، دەهێننەوە، کە ســەرباری ئەوەی لەلایەن خەلیفە عەباسییەکانەوە بەگورزو گۆپاڵ سزاو ئەشــکەنجەدراوە، کەچی بەردەوام ئامۆژگاری هەوادارانی خۆی کردوە، تەنها بەدڵ، بەرهەڵســتی بۆچونو باوەڕی نا سوننەتیو نا سەلەفیانەی خەلیفەکانی عەباسی بکەنو نەکەن لەگوێڕایەڵیکردنیان دەربچن، چونکە سەرەنجامی بەرهەڵستی خەلیفەو دەسەڵات، پەرتەوازەییو خوێنڕژانی موسوڵمانانە. ئیمام ئەحمەد، لەیەکێک لەوتە بەناوبانگەکانیشــیدا دەڵێت «پێم وانییە، دەرچون لەفەرمانی ئەم خەلیفانەی عەباســی کارێکی شــەرعیو دروســت بێت». ئەم بەســەرهاتو هەڵوێستەی ئیمام ئەحمەد، بۆتە بنەمای بیریکردنەوەی سەلەفییەت دەربارەی دەسەڵات، لەبەر رۆشنایی ئەمەشدا حەنبەلییە پێشینەکانو ســەلەفییەکانی ئێستای سعودیە، تەنانەت دوعای شــەڕکردنیش لەسوڵتانو فرمانڕەوا، با خراپەکارو ستەمکاریش بێت، یاساغ دەکەن، ئیتر ئەوە بەرهەڵستیکردنو بەرەنگاربونەوەی چەکدارانە، بابوەستێت[2]. کە لای ئەوان دەچێتە ریزی کارە یاساغو قەدەغە شەرعییەکان.

لەبیــری ســەلەفییەکاندا ملکەچکردن، بۆ ئەو دەســەڵاتدارانەش کە بەزەبری هێزو بەتۆپزی خۆیان ســەپاندوە بەســەر موســوڵماناندا هەر فەرزەو هیــچ جیاوازییان لەگەڵ ئەوانەدا نییە بەشــەرعی یان شــورا هاتونەتە سەرتەخت. تەنیا حاڵەتێک کە ســەلەفییەکان رێگا دەدەن، خەڵک بەهۆیەوە، شــوڵ لەدەسەڵاتو سوڵتانی خۆیان هەڵکێشن، کاتێکە سوڵتان کوفری ئاشکراو بێ پێچو پەناو رون دیاربخات، ئیمکاناتو توانای پێویســتیش لەبەردەستدابێت، بۆ گۆڕینی ئەو سوڵتانە کوفرکەرە، بەجۆرێک گۆڕینی نەبێتە هۆکاری گۆبەنو پاشاگەردانیو رژانی خوێنی زۆر[3].

ئەدەبیاتــی نوێی ســەلەفییەت بــە «بیدعەی هاوچــەرخ»، گوزراشــت لەکودەتاو

---

١. عبدالعزيز عبدالله بن باز: هەمان سسەرچاوەی پێشو، ل ٢٥

٢. ابن أبى يعلى: طبقات الحنابله، ٣٦/٢، وەرگيراو لە معامله الحكام، ل ١٣

٣. عبدالعزيز عبدالله بن باز: المعلوم من واجب العلاقه بين الحاكم والمحكوم، ل ١٤

هەڵگەڕانەوەو یاخیبونی چەکدارانە لەدژی سوڵتان دەکاتو پێیان وایە، گۆڕینی کوفرو خراپەکاری ســـوڵتان، کاتێک ڕەوایە ئەوانەی بەتەمـــای گۆڕانن، لەروی ژمارە، هێز، پیتاک، لێهاتوییەوە، تێروتەواوو پۆشـــتەو پەرداخ بنو بتوانن خێرا باردودۆخ کۆنترۆڵ بکـــەن، ئەگەرنا، نابێت پەنا ببەنە بەر ئاژاوەو خۆیانو خەڵکیتریش بەر مەترســـی بخەن[1]. لەبری پەنابردنیش بۆ کودەتاو یاخیبون، سەلەفییەکان، داوای دان بەخۆداگرتن لەلایەنگرانیان دەکـــەنو گۆڕینی خراپە بەئامۆژگاریو بانگەوازکردنو فرمان بەچاکەو نەهی لەخراپە، دەســـپێرن. لەبری سەرقاڵبون بەسیاســـەتو حیزبایەتیو پرسەکانی دەســـەڵات، زیاتر خۆیان ١ـ بەپاککردنەوەی عەقیـــدەی خەڵک، ٢ـ بەرەنگاربونەوەی بیدعە، ســـەرقاڵ دەکەن. هەروەها لەســـەر جیهان بینییەک کاردەکەن، کە شـــیرکو بیدعە بەگەورەترین بەڵاو پەتای خراپی نێو ئەهلی ئیســـلام دادەنێت، سەرکەوتن لەم دو ئەرکەشـــدا بەدەروازەی بەختیاریو کامەرانیی هـــەردوو دنیای مرۆڤەکان لەقەڵەم دەدەن.

لەدوای سەردەمی ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەلیشەوە، سەلەفییەکان تەنها گوشاری بارودۆخو بۆشـــایی نیمچە دورگەی عەرەب، لەرێـــگای بزوتنەوەی وەهابییەوە تێکەڵ بەسیاســـەتی کردون، کارکردنی ئەم تەوژمەش لەنێو سیاســـەت، هێندە تەمەن درێژ نەبوەو دوای ئەوەی وەهابییەکان، دەســـەڵاتی دیـــنو دنیایان وەک هێلکەی پاککراو رادەستی ئال سعود، کرد، ئیتر لەسەر شانۆی سیاسیو حوکمڕانی پاشەکشەیانکردو لەئێستادا بیریارو زاناکانی سەر بەم بیرە شانازی بەوەوە دەکەن، دورن لەسیاسەتو بانگەوازەکەیان، «دەسەڵات ویستو دنیایی نییەو وەک حیزبە ئیسلامییەکان هەڵپەی دەسەڵاتو حوکمڕانیی ناکەن»[2]*.

سەلەفییەکان، لەهەلومەرجو بارودۆخی نوێو هاوچەرخی زۆربەی وڵاتە ئیسلامییەکاندا،

١ـ هەمان سەرچاوەی پێشو، ل ١٥ ـ ١٦

٢ـ بۆ درێژەی ئەمە بروانە: أبراهیم العسعس: السلف والسلفیون، لا ٤٨

* بەشـــێکی بەرچاوی گوتاری ئەمدواییەی ســـەلەفییەکان بۆ دژایەتی حیزبایەتی ئیســـلامیو حیزبە ئیســـلامییە تەقلیدییەکانی وەک ئیخوان موســـلیمینو تەحریرو......هتد. تەرخانکراوە، سەلەفییەکان هێندە دژی دروستکردنی حیزبی ئیسلامین زۆرجار بە کۆمەڵی لاحیزبی دەناسرێن. دیارترین بیرمەندەکانی بیری لاحیزبی لەنێو ســـەلەفییەکاندا رەبیع هادی ئەلمەدخەلی سعودیو موقبیل ئەلوادعی یەمەنییە.

هیچ داخوازیو پاساوێکی راپەڕینی چەکدارانە نابینن. بەبۆچونی ئەم دیدگا ئیسلامییە، تا دەسەڵاتو حکومەتەکان، بەئاشکرا دوژمنایەتیکردنی ئیسلامو بێباوەڕیی خۆیان، رانەگەیەننو بەرواڵەتو لەدەستورو یاسایاندا بەئیسلامەوە پەیوەستبن، دژایەتیکردنیان رەواو شەرعیی نییە. تەنانەت شێخ بن بازی موفتی کۆچکردوی سعودیەو شێخ محەمەد ناسرەلدین ئەلبانی، راگەیاندنی جیهادیان لەجەزائیر بەشۆڕشی خەواریجەکان** چواند، چونکە لەژینگەو کۆمەڵگایەکی موسوڵمان، راگەیەنرا [1].

لەچەند بۆنەیەکیتردا، سەلەفییەکان، «حەزی دەسەڵاتخوازیی»و «کردە خۆکوژییەکانی»، هەندێک لەحیزبو تەوژمە ئیسلامییەکانیان، سەرکۆنەو سەرزەنشتکردوە. بەبۆچونی سەلەفییەکان، حەماسەتی هەندێک لەبزاڤە ئیسلامییەکان، بۆ تەکفیرکردنی کۆمەڵگاکانو خەڵکی موسوڵمان، دەگەڕێتەوە بۆ کاڵفامیو تێنەگەشتنی بیرمەندە حیزبیو حەرەکییەکان، لەکولتورو رێبازی پێشینانو بنەما شەرعییەکانی گۆڕینی خراپەکاریو دەسەڵات.

---

** یەکەم گروپە لەمێژوی ئیسلام سەریانهەڵدا. دژ بەئەمیری ئیمانداران عەلی کوڕی ئەبوتالیب، کاریاندەکردو هەندێک لەهاوەڵەکانی پێغەمبەریان بەکافر دادەنا. بڕوایان بەکودەتاو راپەڕین هەیە دژی خەلیفە ستەمکارو خراپەکارەکانو ئەوەشی تاوانی گەورە بکات بەکافری دەزاننو لەفەرمودەی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم)، بەسەگی دۆزەخ ناوبراون.

http://www.alhawali.com

١ـ بڕوانە مجلە السلفیە، العدد ٣، ١٤١٨، الریاض،

# بەشی سێیەم

# سەلەفییەتو ئاینزا ئیسلامییەکان

سەلەفییەت، تێڕوانینێکی سەرەکیی نێو بیرکردنەوەو ڕەوتە ئیسلامییە جۆراوجۆرەکانە، وەک پێشـــتر ئاماژەمان پێکرد، لەبواری شـــەرعزانیدا، محەمـــەد عەبدولوەهاب، کە نوێکەرەوەی ئەم تێڕوانینەیە، شوێنکەوتەی بۆچونو ئیجتیهادەکانی ئیمام ئەحمەدی کـــوڕی حەنبەل بـــوە. بەڵام هەم ناوبراوو هەم ڕێبەرەکانیتری ســـەلەفییەت، جەخت دەکەنەوە، بەهیچ ئاینزایەکی دیاریکراوی ئیسلامییەوە، پەیوەست نین، بەڵکو لەبری شـــوێنکەوتنی مەزهەب، شـــوێنی قورئانو فەرمودەو تێگەشـــتنی پێشینانی ئیسلام دەکەون. لەمبارەیەوە، محەمەد عەبدولوەهاب، دەبێژێت «ئاینزای ئێمە، ئاینزای ئیمامی ســـوننە، ئەحمەدی کوڕی حەنبەلە، ئەگەر لەجێگەیتریشەوە، سوننەتی پێغەمبەرمان پێگەشـــت، یەکڕاست جێبەجێی دەکەینو لەبەر قسەی کەس دەستبەرداری نابین»[1]. هەروەها لەوتەیەکیتردا دەبێژێت «سەرزەنشـــتی هیچ کـــەس ناکەین کە دوای چوار ئیمامەکـــە ـ ئەبـــو حەنیفە، مالیک، شـــافیعی، ئەحمەد ـ بکەوێـــت، جگە لەمانەش هیچمان بەلاوە پەسەندنییە»[2]. ئەم ڕێبازگەیە، پێیوایە، شەریعەتی ئیسلام، زۆر لەوە بەرفراوانترو گەورەترە، کە بخزێنرێتـــە چوارچێوەی یەک ئاینزاوە. هەر لەبەرئەمەش لای سەلەفییەکان هیچ ئاینزایەک یەکســـان نییە بەهەمو ئیسلام، هەروەها پێیانوایە فرەیىو بونی ڕاوبۆچونی جیاواز لەشەریعەتدا، شتێکی ئاساییو ڕێگەپێدراوە، چونکە دەقو سەلمێنراوەکانی شەریعەت، زۆرو بەربڵاونو دەشێت هەمویان بەرچاوی ڕێبەرانی ئاینزاکان نەکەوتبنو پێداگریی دەکەن، لەســـەر ئەوەی ئاینزا فیقهیو ئیسلامییەکان، لەســـەردەمەکانی دواتردا گەڵاڵەکراونو بەر لەم ئاینزایانەش ســـەحابەو شوێنکەوتەو شـــوێنکەوتەی شوێنەکەوتەکانیان (اتباع التابعين)، بەبێ دەمارگیری بۆ هیچ ئاینزاو ئیمامێکو لەبەر ڕۆشنایی قورئانو فەرمودەی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) دا ، ئاینداری

---

١ـ أبو مسعود الندوي: محمد بن عبدالوهاب، ل ٤٨

٢ـ عبدالعزيز الرومى وآخرون: مؤلفات الشيخ محمد بن عبدالوهاب، الرسائل الشخصيه، ١٠٧

خۆیان بەباشترین شێوەکردوەو خەڵکیش دەبێت چاو لەوان بکەن.
سەلەفییەکان، لەبری ئینتیما بۆ مەزهەبە دیاریکراوەکانی ئیسلام، ڕێبازی خۆیان بە ڕێبازی «ئەهلی سوننەتو جەماعەت»، «الفرقه الناجیه»، «الطائفه المنصوره»، «أهل الحدیث» دەناسێنن. ئەم ناوو نازناوانەش سەلەفییەکان، جیا دەکاتەوە لە گروپەکانی جەهمی ـ بڕوایان بەسیفاتی خودا نییە ـ، ئەشعەری ـ بڕوایان بەچەند سیفەتێکی کەمی خودا هەیە ـ لەگەڵ کۆمەڵێکی زۆریتر لەگروپو ڕێبازگەی ئیسلامیی.
گوتارو ئەدەبیاتی سەلەفییەکان، پڕە لەشیکارکردنو ڕاڤەکردنی فەرمودەیەکی دروستی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، کە دەفەرموێت «ئەم ئوممەتە (ئوممەتی ئیسلام)، بەسەر حەفتاوسێ کۆمەڵو گروپدا، پەرتەوازەو دابەش دەبێت. جگە لەیەک کۆمەڵ، هەمویان لەدۆزەخدانو ئەو کۆمەڵەش (جماعة) یە»[1]. لەگێڕانەوەیەکیتری فەرمودەکەدا هاتوە «هەمو ئەو کۆمەڵو گروپانە، لەدۆزەخدان، تەنها یەک دانەیان نەبێت، ئەوانیش ئەوانەن کە لەسەر ڕێگای منو هاوەڵەکانمن»[2]. بەبۆچونی سەلەفییەکانیش، ئەم دو فەرمودەیە، بنەڕەتی قەدەغەکردنو نابوتکردنی تێکڕای ڕێبازگە، فەلسەفیو سۆفیگەرییە میتافیزیکییە، داهێنراوەکانی دوای سەردەمی هاوەڵەکانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)و شوێنکەوتەکانیان. هەروەها سەلەفییەکان، ئەم فەرمودەیە دەکەنە بەڵگەو هۆکاری دورکەوتنەوەیان، لەو حیزبو گروپە ئیسلامیانەی جیهانی ئیسلام کە ناکۆکییان لەسەر چۆنیەتی گێڕانەوەی شەریعەت بۆ حوکمڕانیکردنو زیندوکردنەوەی خەلافەتی ئیسلام، بەسەر چەندین حیزبو تەوژمو بەرەی ناکۆکو جیاوازدا پەرتەوازەو دابەشی کردوون.
سەلەفییەکان، بەتوندی بەگژ ئەو گروپو بیرکردنەوانەدا دەچنەوە کە لەگەڵ تێگەشتنو بیرکردنەوەی زانایانی پێشینی لەچەشنی ئیمام ئەحمەد، ئیبن تەیمیە، تەحاوی، ئەبی عیز، ئیبن قەیمو.....هتد. دا ناجۆرو نەگونجاون. هەروەها جەخت دەکەنەوە، بیدعەکردنو داهێنان لەخواپەرستی.. هەر حەفتاو دوو گروپە ئیسلامییە ئاماژەپێکراوەکەی نێو فەرمودەکەی، بەلۆمەکردنو سەرزەنشتکردنی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)، گەیاندوە. هەر داهێنانکردن لەئاینداریشدا ئەم گروپانەی لەئەهلی سوننەو جەماعەو لەشوێنکەوتوانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، دابڕیوە. لەدیدی

١ـ بڕوانە سەنەدی فەرمودەکە لەمحمد ناصرالدین الالبانی: سلسله الاحادیث الصحیحه ٢٠٤/١١

٢ـ سلسله الاحادیث الصحیحه، ١١/ ٢٠٤

ڕەوتی ســـەلەفیدا، بنەڕەتو نێوەڕۆکـــی بیروباوەڕی هەمو گروپـــە بیدعەچییەکان، لەبیروباوەڕەکانی، خەواریج ـ شیعە ـ مورجیئە ـ قەدەری ـ ییەوە سەرچاوە دەگرێت[1]. هەر لەبەر ئەمەش، لەهەمو دەرفەتو هەلو مەرجێکدا بیروباوەڕو ریشەی بیرکردنەوەی ئەم چوار گروپەیان داوەتە بەر گوڕمی رەخنەو تانەو پلار.

جگە لەم چوار گروپەو هاوباوەڕەکانیان، ســـەلەفییەکان بەشیاوی نازانن، هیچ کەس بەبـــێ بەڵگەی رون، حوکمی بیدعـــەو گومڕایی بداتە پاڵ، هیچ گروپو کۆمەڵێکیتری موســـوڵمان، «چونکـــە حوکمدان بڕیارێکی قورســـەو بەرپرســـیارێتییەکی گەورەی بەدواوەیە.. ئەگەر تۆمەتی بیدعەچێتی بەسەر هەر کۆمەڵو گروپێکدا ساغ بویەوە، ئەوە نابێت موسوڵمانان بەئاسایی مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن.. نوێژکردن لەپشتیانەوە، ژنو ژنخوازیکردن لەگەڵیان، خواردنی سەربڕدراوی دەستیان، ئامادەبونی مەراسیمی ناشتنی مردویان، بەسەرکردنەوەی نەخۆشو میرات لێگرتنیان، وەرگرتنی شایەتییان لەدادگا.. پرســـیارو گومانی دەکەوێتە سەرو لەچەند حاڵەتێکیشـــدا یاساغو حەرام دەبێت»[2]. هەروەها ســـەلەفییەکان، رەتکردنـــەوەو دژایەتیکردنی بیروبـــاوەڕی بیدعەچییەکان بەواجبی شـــەرعیی دەزانن‌و لەبارەی بەرپەرچدانەوەی بیدعەچییەکانیشـــەوە، دەڵێن «ئەرکێکە لەئەستۆی موسوڵماناندا»[3].

**خەواریج:** ناکۆکی‌و دژایەتی سەلەفی‌و خەوریجەکان، لەمەسەلەی تەکفیرو شەرعیەتدان بـــە هەڵگەڕانەوە لەکۆمەڵگای موســـوڵمانانەوە ســـەرچاوەدەگرێت. خەواریجەکان، پێیانوایە، کوفری کرداریی (کوفری بچوک) لەنێو شـــەریعەتی ئیسلامدا نییە، هەمو تاوانکەرێکی گەورەش کافـــرە[4]. خەواریج، هێندە توند بیردەکەنەوە، تەنانەت زۆرێک لەهاوەڵەکانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسـلم) بە کافر دەزانن‌و لەسەرەتای سەرهەڵدانیاندا، شـــاری مەدینەیان بە (دار الكفر) لەقەڵەم دەداو دژی چوارەم خەلیفەی راشـــیدین،

١. محمد عبدالهادی المصری: أهل السنه والجماعه، ل ١٢٣ ـ ١٢٤

٢. د. ابراهیم بن عامر الرحیلی: موقف أهل السنه والجماعه، ل ٣٤٣ ـ ٤٤٨

٣. د. ربیع بن هادی بن عمیر المدخلی: منهج أهل السنه والجماعه فی نقد الرجال والكتب والطوائف، ل ١٢٧ ـ ١٣٥

٤. د. ناصر بن عبدالكريم العقل: دراسات فی الافتراق....، ل٣٥

عەلـــی کوڕی ئەبوتالیب، کارو چالاکییان ئەنجامدەدا[1]. ئەم کۆمەڵە چەکدارە، هەر بە هەڵگەڕانەوە لەئیمام عەلی، نەوەســـتان، بەڵکە سەربازگەیەکیان لەنەهراوانی عێراق، دامەزراندو کەوتنە کوشتاری سوپای خەلافەتو خوێنی ژمارەیەکی زۆر لەسەحابەکانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم ) یان ڕژاند[2].

ئەم چەشنە سیاســـەتو بیرکردنەوەی خەورایجەکان، تەواو پێچەوانە دێتەوە لەگەڵ لەبیری ســـەلەفییەکان. چونکە ئەوان، شۆڕشـــکردن دژی خەلیفـــە، بەکردارێکی دژ بەشەرع دەزانن. ڕێگاش نادەن، تەنیا لەسەر تاوانکردنو ئەنجامدانی گوناهی گەورە، کەس کافر بکرێت، با تاوانەکان کوشـــتن، زیناکردن، تەنانەت جێبەجێکردنی یاسای دەستکردیش بێت. بەلای سەلەفییەکانەوە، کافربون پەیوەندی بەبیروباوەڕەوە هەیەو کرداری خراپ کەس کافر ناکات. سەلەفییەکان، خەراویج بەهەڵگەڕاوە دەزانن‌و ئاماژە بەفەرمودەیەکیش دەکەن دەربارەی ئەم گروپە کە تێیدا، پێغەمبەر(صلی الله علیه وســـلم)، هەواڵیداوە: خەواریج، وەک شـــیری لەنێو کەوان دەرچوو، لەئاینی ئیسلام دەردەچن. هەروەها پێیانوایە، هەرکەس شایتمانی ئیسلامی هێنا، دێتە ناو بازنەی ئیسلامو ماڵو خوێنی پارێزراوە. لەم ڕوەشـــەوە ئاماژە بەبەسەرهاتێکی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم )، دەکەن کەناڕەزایی توندی بەرانبەر کوشتنی کەسێکی چەکدار دەربڕیوە لەسەردەستی ئوســـامەی کوڕی زەید، لەمیانەی جەنگو بەرەنگاربونەوەدا کەشـــایەتمانی هێنابو. ئوسامە، بەوە پاساوی دەهێنایەوە بۆ پێغەمبەر، «کابرا لەترسی شمشێر شایەتمانی هێنا»، بەڵام پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم )، بەدەم ناڕەزایی دەربڕینەوە ڕەخنەی ئەوەی لەئوسامە دەگرت»، تۆ دڵت شەقکردبو تابزانیت لەترسدابو؟!».

لەئەدەبیاتو گوتاری ســـەلەفییەکاندا، خەواریج سیمبولو هێمای بیری دژە سوننەتی ڕاستەقینەیە، بیری خەواریجیش، چاوگو سەرچاوەی ئەو حیزبو ڕێکخراوە ئیسلامییە هاوچەرخانەیە کە پێ لەسەر بەرپاکردنی شۆرشی چەکداریی دادەگرن لەنێو کۆمەڵگا ئیسلامییەکانداو دەوڵەتو هەرێمو شـــارە موسوڵمانەکان بە (دار الکفر)و کۆمەڵگای جەهالەت لەقەڵەم دەدەن.

---

١ـ أحمد أمين: فجر الاسلام، ل ٢٥٦ ـ ٢٥٨

٢ـ عثمان بن محمد آل خميس: حقبه من التأريخ، ل ٣٨ ـ ٤٠

**مورجیئە:** كێشەی بیری سەلەفیی لەگەڵ مورجیئەدا، لەسەر ئەژمارنەكردنی كرداری مرۆڤــە، وەک بەشــێک لەئیمانو بــاوەڕ.. مورجیئە پێیانوایە، كردار بەشــێک نییە لەئیمانو باوەڕی مرۆڤ، ئیمان تەنها باوەڕی دڵو دانپێدانانی زمانی مرۆڤە.. ئەوەندە بەسە مرۆڤ بەدڵو زمان باوەڕی بەئیسلام هەبێت، لەدوای ئەمە هەر تاوانو كردارێكی خراپیــش بەئەنجام بگەیەنێت، زیــان بەباوەڕو ئیمانەكــەی ناگەیەنێت[1]. ئەم جۆرە ناســاندنەی ئیمانیش لەلایەن مورجیئەكانەوە، بەلای بیری سەلەفییەوە رەتكراوەیەو تێكڕای زانایانی نێوداری پێشــین، ئیمان، بە باوەڕی دڵ.. گوفتاری زمان.. كرداری ئەندامەكانی جەستە، لەقەڵەم دەدەن[2]. لالەكائی لە (شرح أصول السنه) دا دەگێڕێتەوە، كــە ئیمام ئەحمەدی كــوڕی حەنبەل دەربارەی ئیمان وتویەتــی «ئیمان كەمو زیاد دەكات.. ئیمان بەكرداری چاک زیاد دەكات بە كرداری باش نەكردنیش كەم دەكات».

ســەلەفییەكان، بەڵگە بەچەند ئایەتو فەرمودەیەک دەهێننەوە، لەسەر ئەژماركردنی كردەوە بەبەشــێک لەئیمان، لەوانەش ئایەتەكانی «إِنَّمَــا يُؤْمِنُ بِآيَاتِنَا الَّذِيــنَ إِذَا ذُكِّرُوا بِهَا خَــرُّوا سُــجَّدًا وَسَــبَّحُوا بِحَمْدِ رَبِّهِــمْ وَهُمْ لا يَسْــتَكْبِرُونَ». السـجدة: ١٥. واتە: هەر ئەوانە بەنیشانەكانی ئێمە باوەڕدارن، كە هەركات نیشانەگەلی ئێمەیان وەبیر بهێننەوە، خۆ دەخەنە ســەر سوژدەو بەسوپاسەوە پەســەنی پاكیی پەروەردگاری خۆیان ئەكەنو خۆیان بەزل نازانن. هەروەها ئایەتی «إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا وَجَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِــهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أُوْلَئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ».الحجرات:١٥. واتە: خاوەن باوەڕ ئەو كەســانەن كە بڕوایان بەخواو پێغەمبەری هەیەو توشــی دوودڵی نەبونو بەگیــانو مــاڵ لەرێگای خوادا تێكۆشــاونو هەر ئەمانە بەراســتیانە. ئەمە جگە لەفەرمودەیەكی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، دەربارەی جۆرەكانی جیهاد، كە موسلیم ریوایەتیكردوەو دەفەموێت «فمن جاهدهم بيده فهو مؤمن، ومن جاهدهم بلســانه فهو مؤمــن، ومن جاهدهم بقلبه فهو مؤمــن، وليس وراء ذلك من الإيمان حبه خردل». لەم فەرمودەیەشدا، كرداری دڵو زمانو ئەندامەكانی جەستە بەئیمان ناوبراوە.

---

١ـ عبدالاآخر حماد الغنيمى: المنحه الٳلهيه، ل ٣٢٥

٢ـ الشيخ عبدالرحمن بن حسن آل الشيخ: فتح المجيد شرح كتاب التوحيد، ل ٤٨

**قەدەری:** قەدەرییەکان، لەراڤەکــردنو لێکدانەوەی واتای قەدەری خوادا، کەتونەتە ناکۆکیو کێشـــەی قوڵەوە لەگەڵ ســـەلەفییەت. قەدەریی جەخـــت دەکەنەوە، خودا کاروکرداری مرۆڤی تەقدیرنەکردوە، هەمو روداوو بەسەرهاتێکیش بەپێی هەلو مەرجو رێککەوت رودەداتو پەیوەندیی بە تەقدیری خوداوەنییە. بەڵام بیروباوەڕی ســـەلەف، لەگەڵ ئەوەی دان دەنێت بەسەربەســـتیو ئازادی مرۆڤ لەرەفتارکردنو مامەڵەکردن، بـــەڵام پێیوایە هەمو کـــردەوەو رەفتارێکی مرۆڤ، لەچوارچێوەی تەقدیرو ویســـتی خوادا رودەدات.. وردودرشـــتی ژیانی مرۆڤو سەرەنجامی هەمو کارەکانی لەدوتوێی (لوح المحفوظ) دا لەئاســـمان، تۆمارو یاداشـــتکراوە. سەلەفییەکان، گروپی قەدەری بەمەجوســـیو ئاگرپەرســـت تۆمەتباردەکەن، چونکە ئەوانیش هاوشێوەی بیروباوەڕە ئێرانـــیو زەردەشـــتییەکان، بڕوایان بەهێزی خولقێنەری خێرو شـــەڕ هەیە. ئەمەش هاوشێوەی دوالیزمەی روناکیو تاریکی نێو بیروباوەڕە ئاگر پەرستییەکانە.

بەپێچەوانەی قەدرییەکانەوە، ســـەلەفییەکان، پێیانوایە: خـــودا عیلمو زانیاری هەیە بەهەمو ئەو شـــتانەی لەدنیاو گەردوندا رودەداتو لەکۆی هەمو ئەو شتانەش ئاگادارە کە بـــەر لەئێمە رویانداوە، هەروەها هەمو شتانەشـــی لەدوتوێـــی پەڕاوێکدا بەناوی (لوح المحفوظ) دا نوســـیوتەوە کە لەئاسماندا پارێزراوە. جگە لەمەش چاکو خراپ هـــەر خودا خۆی دروســـتیکردوە، بەڵام ئەوە هەیە خوا چاکەو باشـــەی پێخۆشـــەو رقی لەســـنوربەزاندنو کاری خراپەیە.. پەیامبەرانی ناردوە بۆ ئەوەی خەڵک لەخراپە دوربخەنەوەو راســـتەرێیان بۆ رون بکەنەوە، هـــەر لەبەر ئەمەش کاری باش دەدرێتە پاڵ خوداو بەپاک رادەگیرێت لەکاری خراپ. لەکۆتاییشدا دەڵێن هەمو ئەوەی لەدنیادا دەگوزەرێت بەویســـتو ئارەزوی خوا رودەداتو کەس بۆی نییە بپرسێت بۆچی خودا ئەوە ئەکاتو ئەوە ناکات؟ هەر شـــتێکی بوێت ئەیکاتو هەرچیشـــی نەوێت روناداتو نابێت.

# سەلەفیەتو سۆفیگەری

یەکەمجار بیروباوەڕی ســـەلەفییەت لەگەڵ بیروباوەڕی سۆفیگەریدا، بەریەک کەوتوەو پێکدادانـــی تونـــد لەنێوانیاندا رویداوە. چونکە چ لەســـەردەمی ئیبـــن تەیمیەو چ لەســـەردەمی محەمەد عەبدولوەهابدا، بانگەوازی سەلەفیگەریی لەنێو ژینگەیەکی پڕ لەبیروباوەڕی ســـۆفیگەریدا کەوتۆتە جموجوڵو چالاکی.. بەشـــێوەیەکی بەرچاویش بنەماکانی ئەم تەوژمە ئیسلامییە فەلسەفییەی کردۆتە ئامانجو داویەتییە بەر شەپۆلی رەخنە.

مێژوی سۆفیگەریی لەخۆرهەڵاتی ئیسلامیدا، زۆر کۆنو دێرینە، مشتومڕو دەمەقاڵەی زۆریش لەســـەر بیروباوەڕو بنەمای بیرکردنەوەی ئاینییان هەیە. بەڵام بەشێوەیەکی گشتی زاراوەی تەسەوفو سۆفیگەری زەینو سەرنجی مرۆڤ، بەلای واتاکانی: وازهێنان لەدنیا.. کەنارگیری.. خۆ زەلیل کردن، رادەکێشـــێت[1]. باوترینو دروستترین بۆچون دەربارەی ریشـــەی ناوی سۆفی، باس لەوەدەکات، سۆفییەکان لەسەرەتادا کۆمەڵێک کەس بون، جلو بەرگی خوری (صوف) یان لەبەرکردوە، هەر بەم هۆیەشەوە ناونراون صوفي واتە خوری پۆشەکان[2]. ئامانج لەپۆشینی جلو بەرگی لەخوری دروستکراویش، لەلایەن سۆفییە یەکەمینەکانەوە، خۆقوتارکردن بوە لەبریقو باقی دنیاو رازیبون بوە بەپۆشاکێکی سادەو هەرزان، بۆ بەدەستهێنانی رەزامەندیی خودا[3].

هەندێک لەرێبەرە ســـەلەفییەکان، شـــێوازی بیرکردنەوەی ســـۆفییەکان دەربارەی شـــەریعەتو ئاینداریی بە «ناشـــەرعی»، هەندێکجاریش «نائیسلامیی»، ناودەبەنو پێیانوایە، زاراوەی ســـۆفی لەســـۆفۆس (sophos) ی گرێکییـــەوە هاتوە، کە واتای حیکمەتو دانایی دەگەیەنێت. بەم پێیەش بەلای ســـەلەفییەکانەوە ناوەکەو لەپشت ئەویشـــەوە ناوەڕۆکەکە، بیانیو نائیسلامییە[4]. ســـەلەفییەکان بۆ پشتڕاستکردنەوەی زیاتـــری بۆ بۆچونەکەیان دەربـــارەی بێگانەبونی ناوو ناوەڕۆکی ســـۆفیگەری، ئەوە

---

١. د. د.محمد خاتمی: الفکر والدین فی فخ الاستبداد، ل ٧٢

٢. هارون بن بشر أحمد الصدیقی: مصادر التلقی عند الصوفیه، ل٢

٣. الغزالی: أحیاو علوم الدین، ل ٦٤

٤. د. محمد بن ربیع المدخلی: حقیقه الصوفیه، ل ١١

بەبەڵگــە دێننەوە، کــە ڕێنمایی‌و بنەمای تەریقەتی نەقشــبەندیی کــە نێودارترین تەریقەتە ســۆفیگەرییە خۆرهەڵاتییەکانە، بەزمانی فارســی گەڵاڵەکراوەو ســەرەتا لەسەردەستی عەجەمەکانی بوخاراو تاشــقەند داڕێژراوەو دواتر بەرگی ئیسلامیانەی بەبەرداکــراوە. بەگەڕانەوەش بۆ ســەرچاوە بنەڕەتییەکانی تەریقەتی نەقشــبەندی لەچەشــنی (المواهب السرمدیه)، (الانوار القدسیه)، (الحدائق الوردیه) (البهجه السنیه فی آداب الطریقه النقشــبندیه)، دەردەکەوێت، دیارترین ناونیشان‌و تەوەرەکانی بیری تەریقەتی نەقشبەندیی، بەزمانی فارسییەو بریتییە لە (هوش دردم: پاراستنی دەرون لەغافڵگیری)، (نظر بر قدم: تەماشاکردنی پێ لەکاتی ڕێکردن)، (سفر در وطن: گەشتی سۆفی لەجیهانەوە بۆلای حەق)، (یاداشت: ئامادەیی دڵ لەکاتی یادکردنەوەی خودا)، (خلوه درانجمن: شوێنی خەڵوەتکێشانی بەندە بۆ خواپەرستی).

دیاریکــردن‌و هەڵبژاردنی تاقە پێناســەیەک بۆ ســۆفیگەری شــتێکی قورس‌و بگرە مەحاڵیشــە، چونکە لەنێو زانایانی کۆن‌و نوێدا، چەندین بۆچون‌و لێکدانەوە لەســەر ناوی تەســەوف هەیە، بەجۆرێک کە ســەهرەوەردی دەڵێت «وتەی گەورە شــێخ‌و ڕێبەرەکان دەربارەی ســۆفیگەریی لەهەزار وتە پترە»[1]. شێخ جونەیدی بەغدادی کە یەکێک لەدامەزرێنەرانی بیری سۆفیگەرییە، دەڵێت «سۆفیگەریی دەستگرتنە بەئاکاری جوان‌و دورکەوتنەوەیە لەئاکاری بەد»[2]. محەمەد عەلی قەساب، دەڵێت «سۆفیگەری کۆمەڵــە ئاکارو ڕەوشــتێکی بەرزو جوانە، لەســەردەمێکی گرنگو لەسەردەســتی کۆمەڵێک خەڵکی ڕەوشــت بەرز ســەریهەڵداوە»[3]. ئەبو فەرەج عەبدولرەحمان عەلی قورەیشی ناســراو بە (ابن الجوزی) یش، پشتڕاستی ئەم بۆچونەدەکاتەوەو، دەڵێت «سۆفیگەریی ڕێبازێکە، سەرەتا بەزوهد، کەنارگیری، خۆ زەلیلکردن، دەستپێکردوە. دواتــر پەیڕەوکەرانــی لەکاتی یادکردنەوەی خوادا دەســتیانکردوە بەســەماکردن‌و جوڵەجوڵ.. خەڵکە گشــتییەکەش، هەندێک بۆ خوداپەرســتی‌و هەندێکیتر بۆ کات بەسەربردن‌و فزولییەت، دوایان کەوتوون»[4].

بەڵام ئەم پێناســانە تایبەتن بە قۆناغی یەکەمی ســەرهەڵدانی بیری ســۆفیگەریی‌و

١. أحسان ألهی ظهیر: التصوف، المنشأ والمصادر، ل ٣٥ ـ ٣٦

٢. هارون بن بشیر أحمد الصدیقی: مصادر التلقی عند الصوفیه، ل ١٦

٣. د. صابر طعیمه: الصوفیه معتقدا ومسلکا، ٣٣

٤. د. محمد بن ربیع المدخلی: حقیقه الصوفیه، ل ١١

ناکرێت بکرێنە بنەڕەتو هەمو ناساندنێک بۆ تەسەوف، چونکە بەمدواییانە سۆفیگەری لەسنوری رەوشتو ئاکارو یادکردنەوەی خودا، تێپەڕیکردوە، لەئێستاشدا سۆفیگەری جگە لەسلوکو ئاکار، عەقیدەو بیروباوەڕێکی جوداو سەربەخۆیە لەنێو بیروباوەڕە ناسراوە ئیسلامییەکان. فەلسەفەو کرۆکی سۆفیگەریی زۆر ئالۆزو شاراوەیە، تەنانەت (مرتعش النیسابوری) دەڵێت «سەراپای سۆفیگەریی ئیشکالو ناواخنو شاردنەوەیە[١]». ئەمەش لەگەڵ رێبازی سەلەفیدا ناگونجێت کە لەسەر ئاشکراییو شوێنکەوتنی هەنگاو بەهەنگاوی دەقەکان بنایتنراوەو جگە لەو رێبازە سونەتیانەی کە لەپێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم )و هاوەڵەکانییەوە، گەشتون بەموسوڵمانان، هیچ رێگاو رێبازێکیتری فەلسەفی داهێنراو، بۆ خودا پەرستی پەسەند ناکەنو گەورەترین پلارو رەخنەشیان لەسۆفیگەری ئەوەیە، «لەژێر کاریگەری فەلسەفەو باوەڕە میتافیزیکییە یۆنانیو فارسییەکاندایە»[٢]*.

سۆفییەکان، لیستێکی درودرێژ ناکۆکیو خاڵی پێکدادانیان لەگەڵ سەلەفییەکاندا هەیە، بەجۆرێک لەفەرهەنگی خەڵکی موسوڵماندا، هەردوو زاراوەی (سۆفی)و (سەلەفی) وەک دوالیزمەیەکی ناکۆکو دژبەیەکی لەچەشنی (رەش)و (سپی)، (ئاو)و (ئاگر)، دێتە بەرگوێو ناودەبرێت. ریشەی ناکۆکی سۆفیگەریو سەلەفییەت، زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ نەگونجانو پێکدادانی سەرچاوەکانی شەرعزانیو شێوازی خودا پەرستی، لای ئەم دو گرۆ ئیسلامییە. چونکە وەک د. محەمەد خاتەمی رونیدەکاتەوە، فەلسەفەو ئاکاری سۆفیگەرانە تێکەڵەیەکە لەشێوازی خوا پەرستیو ئاکاری هیندی - یۆنانیو لەگەڵ ئیسلام ئاوێتەکراوەو گونجێنراوە[٣]. سۆفیگەری لەتەوژمو بنەمای رەهبانیەتو دنیانەویستییەوە، سەرچاوەیگرتوە. سەلەفییەکانیش، هەمو لێکدانەوەو کارلێککردنو ئاوێتەبونێک لەگەڵ راڤەو تێگەشتنە بیانییەکان بۆ ئیسلامو دنیا نەویستیو خۆزەلیلکردنی بێ بەڵگە بە «زیادەرۆییکردنو رۆچون لەئایندا» لەقەڵەم دەدەن. بۆ رەتکردنەوەی دنیانەویستیی سۆفیانەش، بەسەرهاتێکی سەردەمی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم )، دەکەنە بەڵگە کە لەسەحیحەکانی بوخاریو موسلیمدا، هاتوەو هەردوکیان

١. هارون بن بشر أحمد الصدیقی: مصادر التلقی عند الصوفیه، ل١٧

٢. عبدالرحمن الوکیل: هذه هی الصوفیه، ل١٩.

* میتافیزیک: جۆرێک فەلسەفەیە کە بڕوای بە پشت ماددیات هەیەو باس لەپەنهانیبونو شتەکانی پشت سروشت دەکات.

٣. بڕوانە: د.محمد خاتمي: الفكر والدين في فخ الأستبداد، ل ٧٥

دەگێڕنەوە، سێ سەحابە، هاتونەتە ماڵی پێغەمبەری ئیسلامو دەربارەی شێوازی خواپەرستی ئەو، پرسیویانە. یەکێکیان وتویەتی: من ژن ناهێنمو ماڵ دروست ناکەم، یەکێکیتر وتویەتی: من گۆشت ناخۆم، یەکێکیتریان وتویەتی: شەوان ناچمە سەر جێگاو هەر نوێژ دەکەم. پێغەمبەریش(صلی الله علیه وسلم )، کە گوێی لەم قسانەبوە رەتیکردۆتەوەو فەرمویەتی «ئەوە چییە هەندێک کەس وا دەڵێنو وادەڵێن؟ من نوێژ دەکەمو دەشخەوم، رۆژو دەگرمو نانیش ئەخۆم، ژنیش دەهێنمو ماڵ دروست دەکەم، ئەوەی پشت بکاتە سوننەتی من لەمن نییە». بوخاری ٣/٢٣٧ ـ موسلیم ٢/١٠٢٠.

سۆفییەکان، بەرێگای جۆراوجۆر، پلەو پایەی رێبەرە «ئەولیا» کانیان، بەرزدەکەنەوە. عەبدولقادر محەمەد ئەبی فەیز (ابن القضیب)، کە یەکێکە لەبیرمەندەکانی سۆفیگەریی دەڵێت «هەمو ئەو خەسڵەتو تایبەتمەندیانەی کە بەپێغەمبەران دراون، بەئەولیاکانیش دراون»[١]. سۆفییەکان، هێندە پایەی رێبەرەکانی خۆیان بەرز رادەگرن، ناوبڕی گەورە دەخەنە نێوانیان لەگەڵ خەڵکی ئاسایی، بۆیە جەخت دەکەنەوە، خەڵکی ئاسایی چۆن بۆ نوێژکردنو خوێندنی تەحیات دادەنیشن، دەبێت ئاوەهاش لەبەردەم شێخو سەرنماکانی سۆفیگەریدا، بەویقارو بەئەدەبەوە لەسەر چۆک، دابنیشن. هەروەها لەرێبازی سۆفیگەریدا، مورید، بۆی نییەو لەو ئاستەدا نییە، کەرەستەو شمەکە شەخسییەکانی رێبەری تەریقەت، بەکاربهێنێتو دەڵێن «هەر موریدێک ئامرازی پرسیارکردنی ـ بۆ ـ ی بەرانبەر شێخو مامۆستاکەی بەکارهێنا هەرگیز سەرفراز نابێت»[٢]. لەچەند سەرچاوەیەکی بنەڕەتیی سۆفیگەریدا، «دەبێت مورید لەهەموشتێکدا وەک شێخ بیربکاتەوە، دەبێت لەخۆشەویستیو رێزگرتنی شێخدا فەنابێت، دەبێت لەبەردەم شێخدا دەستنوێژ نەگرێتو لەبەرچاوی شێخ نوێژ نەکات، لەحزروی ئەوداو بەبێ مۆڵەتی شێخ قسەنەکات، لەحزوریدا نانو ئاو نەخوات، هیچ رەخنەو گازندەیەک لەشێخ نەگرێت، هەمو کاروکردارێکی شێخ بەراستو دروست بزانێت، نابێت سێبەری خۆی یان جلو بەرگی بکەوێتە سەر شێخ، دەبێت لەبەردەستی شێخدا وەک مردوی بەردەستی مردوشۆر وەهابێت، هەر رزقو رۆزییەکی هەیە لەنێوچەوانی شێخی بزانێت، ئەگەر شێخ شتی بەرواڵەت خراپو حەرامیشی کرد، نابێت مورید ناڕەزایی لێدەربڕێت،

---

١. هارون بن بشر أحمد الصدیقی: مصادر التلقی عند الصوفیه، ل

٢. د. محمد بن ربیع المدخلی: حقیقه الصوفیه، ل ٢٠

چونکه شـــێخ پشـــت پەردە دەزانێـــت»[1]. لەرەخنەگرتنو رەتکردنەوەی ئەمەشـــدا ســـەلەفییەکان، ژیانو بەســـەرهاتی، پێغەمبەری ئیسلام(صلی الله علیه وســلم)، بەبەڵگە دەهێننەوە کە ســـەروەری پێغەمبەرانو باشترین کەسە لەسەر زەوی. ئەم پێغەمبەرە هەڵبژێردراوە لەهەموکاروبارێکدا، پرسو رای بەســـەحابەو کەسە نزیکەکانی کردوە.. خوداش بەو گەورەییەی خۆی فەرمانـــی پێکردوە گوێ لەدەوروبەری بگرێتو ئەوەتا فەرمان دەکات بەپێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)، «وشاورهم فی الامر». هەروەها سەروەری پێغەمبەران، بەشـــێوەیەکی عادەتیو ئاسایی ژیاوە.. تێکەڵیی خەڵکی کردوە.. هیچ کات خـــۆی لەدەوروبەرەکەی جیانەکردۆتەوەو دەڵێن «لەکاتێکد پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)، ئاوەها مامەڵەی کردبێتو ئاسایی ژیابێت، ئیتر شێخو ئەولیاکانی پاشین، چین تا کەس بۆی نەبێت رەخنەیان لێ بگرێتو بۆکەس رەوانەبێت وشـــەی پرســـی - بۆ - یان ئاراستەبکات یان لەحزوریاندا قسەبکاتو رای خۆی دەربڕێت»؟!.

ئیمامـــی غەزالی کە هەوڵیداوە ســـۆفیگەری بکاتە رێبازێکـــی پەروەردەیی، دەڵێت «کەعبە دێتە خزمەت هەندێک لەپیاوچاکانو تەواف بەدەوریاندا دەکات[2]». هەروەها نەبهانـــی، باس لەوەدەکات، کەعبەو بەردە رەشـــەکە، هاتون بـــۆلای محێدین ئیبن عەرەبیو بەچواردەوریدا سوڕاونەتەوەو وانەیان لەلا خوێندوەو داوایان لەئیبن عەرەبی کردوە بەرزیان بکاتەوە بۆ پلە باڵاکان[3]. ئیبن عابدینی نەقشـــبەندی، ئەوە دەخاتەڕو «ئەگەر کەعبە هات بۆ زیارەتی پیاوچاکان، ئەوە دروســـتە روبکەیتە زەوییەکەی بۆ نوێژکردن»[4]. ئەمانەش سەلمێنەری ئەوەن، کە سۆفییەکان پێیان وایە کەعبە لەزەوی هەڵدەکنرێـــتو بۆ تەبەڕوک پێکردنیان، دەچێتە ســـەر مەقـــامو گۆڕی «پیاوچاکو ئەولیـــاکان». شـــێخو رێبەری تەریقـــەت، هێندە بەلای رێبازی ســـۆفیگەریو بەلای تەریقەتی نەقشـــبەندییەوە گرنگە دەڵێن «هەرکەس شـــێخی نەبێت، شەیتان دەبێتە شـــێخی». «هەرکەس شـــێخێک نەگرێت بۆخۆی، ئەوە ســـەرپێچی فەرمانی خودای کـــردوە.. هەزاران کتێب لەبەربکە، ئەگەر شـــێخت نەبێت، هیدایەت وەرناگیریت[5]» .

١ـ بڕوانە الطریقە النقشبندیە لەنوسینو ئامادەکردنی عبد الرحمن محمد سعید دمشقیە

٢ـ أحیاء علوم الدین ٢٦٩/٢

٣ـ جامع کرامات الاولیاء ١٢/١

٤ـ حاشیە ابن عابدین ٣٠٢/١

٥ـ الحدیقە الندیە فی الطریقە النقشبندیە ص ٣١ لمحمد بن سلیمان البغدادی

هەروەها سۆفییەکان دەڵێن «شێخ وەک پلورگی پاسار وەهایە، لافاو لەزەریای قوڵی ئەوەوە دەرژێتە نێو دڵی مورید»[1].

ســەلەفییەکان، پێیان وایە ئەم هەڵوێســتو بیرکردنەوەی ســۆفییەکان دەربارەی پلەوپایــەی شــێخەکان، کتو مــت، کۆپیکــردنو لاســاییکردنەوەی دابو نەریتی خاچپەرســتەکانە لەنێو ئیسلام.. ئەوانیش لە ئینجیلی یوحەنادا (١٤: ١٦) ئەوەیان داوەتە پاڵ مەسیح کە گوایە وتویەتی «من رێگای راستی ژیانم، کەس ناتوانێت بگاتە باوک (مەبەست خودایە) لەرێگای منەوە نەبێت»[2].

بەشــێکی زۆری رێبازی سۆفیگەریی، لەســەر «حەقیقەت» یان «زانستی پەنهانی - علــم الباطن»، بنیاتنراوە کە بەلای ئەوانەوە، هاوتای شــەریعەتەو بریتییە «لەدیوە شاراوەکەی ئاین». بەم هۆیەشەوە بانگەشەی ئەوەدەکەن رێبەرو سەر تەریقەتەکانیان «بەرچاو رۆشن»و «پەنهانی زان» ن. سۆفییەکان پێیانوایە لەنێو شێخو ئەولیاکاندا کەسانێک دەگەنە پلەی کەماڵو نازناوی «قوتبی زەمان»، وەردەگرن. ئەم قوتبانەش «جێگای ســەرنجی خودان لەســەر زەویو لەهەمو سەدەو ســەردەمێکدا کاروباری خەڵــک رادەپەڕێننو ئاگاداری هەمو ئاشــکراو نهێنییەکــن». زۆرجار ئەم قوتبەش لەئەدەبیاتی سۆفیگەریدا بە غەوس ناودەبرێتو مەبەست پێی فریادڕەسو دابینکەری پێداویســتییەکانی مرۆڤە[3]. ئەلکەوســەریی، باس لەوەدەکات، حەســەنی شازلی کە یەکێکە لەشێخەکانی سۆفیگەری بانگەشەی ئەوەیکردوە، سەراپای (لوح المحفوظ) ی لەئاسمان دیوەو وتویەتی «ئەگەر لەبەر بەکارهێنانی ئەدەب نەبێت، لەگەڵ پێغەمبەر، ئێستا پێم دەوتن کێ کامەرانو بەختیارو کێ رەنجەڕۆیە»[4]..

رێبەرە ســەلەفییەکان، رەخنەی ئەوە لەسۆفییەکان دەگرن کە رێبازی خۆیان لەسەر داهێنانــکاریو زیادەرۆییکردن، لەعیبادەتو ئاینداریدا دامەزراندوە.. رێچکەکەیان پڕە لەســۆزو عاتیفەو حیکایەت.. پابەندبون بە شــەریعەتو دەقی قورئانو فەرمودەیان

---

١ـ البهجه السنیه فی آداب الطریقه الخالدیه النقشبندیه ٣ لمحمد الخانی ط: مکتبه الحقیقه اسطنبول.

٢ـ بۆ زیاتر لەمبارەیەوە بڕوانە بروانە الطریقه النقشبندیه، عبدالرحمن محمد سعید دمشقیه، نشر موقع الفرقان

٣ـ عبدالرحمن الوکیل: هذه هی الصوفیه، ل ١٢٤

٤ـ ارغام المرید شرح النظم العتید لتوسل المرید برجال الطریقه النقشبندیه للکوثری ص ٣٩.

بەلاوە گرنگ نییە. لەبەرانبەریشـــدا ســـۆفییەكان دەڵێن «نەكـــەی بێژی تەریقەتی تەســـەوف لەقورئانو ســـوننەدا نەهاتوە، ئەوەی وابێژێت كوفرە». هەروەها دەڵێن «خراپترین كەس ئەوانەن تانەو رەخنە لەسۆفیگەری دەگرن»[1].

ســـەلەفییەكان پیرۆزكردنی «پیاوچـــاكو ئەولیا»و بەندەكانیتری خـــودا، تاڕادەی هاوارتێكردنو پەناپێگرتن، بەشیرک (هاوەڵ بۆ خوا دانان) لەقەڵەم دەدەن، بەڵگەش بـــەو فەرمودانەی خودا دەهێننەوە كە پاڕانـــەوەو هاوارتێكردن، تەنهاو تەنها تایبەت دەكات بەخـــۆیو دەفەرموێت «وَأَنَّ الْمَسَـــاجِدَ لِلَّهِ فَـلاَ تَدْعُوا مَعَ اللَّهِ أَحَـــدًا». الجن ١٨ واتە: مزگەوتـــەكانماڵی خودان، دە لەگەڵ خودا هاواری كەســـیتر مەكەن. هەروەها «قُلْ إِنَّمَـــا أَدْعُـــو رَبِّي وَلَا أُشْــرِكُ بِهِ أَحَدًا» الجـــن: ٢٠ واتە: بێژە من هەر هاوار لەپەروەردگاری خۆم دەكەمو كەسیتر ناكەم بەشەریكی. هەروەها ئایەتی «وَلاَ تَدْعُ مِن دُونِ اللَّهِ مَا لاَ يَنفَعُكَ وَلاَ يَضُرُّكَ» یونس: ١٠٦ واتە: جگە لەخوا هانا بۆ شتێ وا مەبە كە نەبەهرەی بۆ تۆ هەیەو نەزیانی لێ دەبینی. ئەگەر كردت، ئەوسا لەناهەقانی. هەروەها ئایەتی «وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّن يَدْعُو مِن دُونِ اللَّهِ مَن لَّا يَسْـتَجِيبُ لَهُ إِلَى يَومِ الْقِيَامَـةِ وَهُمْ عَن دُعَائِهِمْ غَافِلُونَ» الأحقاف: ٥-٦. واتە: كێ لەو كەســـە گومڕاترە هاوار بۆ غەیرە خوا دەبا؟ بۆ كەســـێ كە تا رۆژی قیامەت وەڵامی ناداتەوەو هەر ئاگاشیان لەپاڕانەوەیان نییە. ئەو كاتەی خەڵک هەمو كۆدەكرێنەوە، ئەوان دەبنە دوژمنیانو حاشا دەكەن لەوانەی كە پەرستویانن.

هەروەها سەلەفییەكان دەڵێن «تەنانەت پێغەمبەریش(صلى الله عليه وسلم)، غەیبو پەنهانی نازانێت چ جای بەندەیەكیتری ئاسایی نێو ئوممەتەكەی. چونكە خودا، فەرمانیكردوە بەپێغەمبەر، بە خەڵک رابگەیەنێت، غەیبزان نییە. «وَلَوْ كُنتُ أَعْلَمُ الْغَيْبَ لاَسْتَكْثَرْتُ مِنْ الْخَيْرِ وَمَا مَسَّـنِيَ السُّـوءُ إِنْ أَنَا إِلَّا نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ».. واتە: ئەی پێغەمبەر بێژە: من خاوەنی سودو زیانی خودی خۆم نیم، مەگەر خودا حەزبكات. ئەگەر نادیارم بزانیایە بەهرەی فرەم چنگ دەكەوتو هەرگیز زیانم توش نەدەهات. من هەر تەنیا ترسێنەرو مژدەدەرم بۆ كەسانێک بڕوادارن.

بەلای سەلەفییەكانەوە، ناوەڕۆكی سۆفیگەری، بریتییە لەشەریک بۆخوا دانانو لەهەمان كاتـــدا دژو پێچەوانەی گەوهەری یەكتاپەرســـتییە، چونكە پایەكانی: فریادرەســـتی (الغـــوث)، غەیبزانـــی، بەدەمەوەچونی مرۆڤی ئاتـــاجو كەســـاس.. تایبەتمەندیو لەدەسەڵاتی هەرە تایبەتی خودان.. بەخشینیشی بەهەر كەسێكیتر لەژێر ناوی ئەولیاو

١. بڕوانە: الحديقه النديه فى الطريقه النقشبنديه لا ٣١. هەروەها المكتوبات الربانيه للسرهندى لا٣٤٧

خۆشەویســـتانی خودا، کردنیانە بەهاوئاستو شەریکی خودا[1]. سەلەفییەکان، بەڵگە بەوەش دێننەوە، لەقورئاندا باس لەوەکراوە، موشـــریکە قورەیشـــییەکانیش، کاتێک پەنایـــان بۆ بتە پەیکـــەرەکان دەبرد، پێیان وابو، نزیکیـــان دەخەنەوە لەخودا «مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَى»، ئەمەش هیچ جیاوازییەکی نییە لەگەڵ ئەو حاڵەتو پلەبەخشینەی سۆفییەکان، بەرێبەرو سەرنماکانیانو بگرە خراپتریشە. سەلەفییەت، جەخت دەکاتەوە، هەموکەس دەتوانێت راســـتەوخۆو بەبـــێ پەنابردن بۆ پیاوباشو وەلی، داوا لەخودا بکات، چونکە خودا فەرمویەتی «وَإِذا سَـــأَلَكَ عِبــادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيــبُ دَعْوَةَ الدّاعِ إِذا دَعانِ فَلْيَسْـــتَجِيبُوا لِي وَلْيُؤْمِنُوا بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُـــدُونَ». البقرة: ١٨٦. واتە: هەرکات، بەندەکانم لەمەڕ من لەتۆ دەپرســـن، من نزیکم. هەرکەس هانام بۆ بێنێت، بێ وەڵام نایهێڵمەوە. با ئەوانیش لەفەرمانی من دەرنەچن، بڕوای تەواویان بەمن بێ، بەشکو رێی راست بەدی بکەن.

کێشمەکێشی قوڵی ســـۆفیگەریو سەلەفییەت، زیاتر لەســـەدەی حەوتەمی کۆچیدا گەشـــتۆتە لوتکە. ئـــەوکات ئیبن تەیمیە، بەشـــێک لەگەورە ڕێبەرانەی تەســـەوفی تەکفیرکرد کە پێیانوابو هەندێک «ئەولیا» لەگەڵ خوادا، ئاوێتەو تێکەڵ دەبن. ئیبن تەیمییە، لەبارەی کوفری ئەو باڵەی سۆفیگەرییش کەخاوەن ئەم بۆچونەن لەچەشنی ئیبن فارز، ئیبن عەرەبی، دەڵێت «کوفری ئەمانە لەکوفری جولەکەو خاچپەرستەکان خراپتـــرو گەورەترە». هەروەها عیززی کوڕی عەبدولســـەلام، محیّدین ئیبن عەرەبی بەکەسێکی کافر داناوە، چونکە ئیبن عەرەبی، جەلالەدینی رۆمی، حەلاج، پێیانوایە، خودا ئاوێتەو تێکەڵ بەدروستکراوەکانی خۆی بوە[2].

ئەم هەڵوێســـتەی ســـەلەفییەکان دەربارەی ئەم رێبەرانەی ســـۆفیگەری، دوابڕیارو هەموشتێک نییە دەربارەی تەسەوفو رێبەرەکانی ئەم رێچکەیە. بەڵکە سەلەفییەکان، جیاوازی دەخەنە نێوان ئەو ســـۆفیانەی مەبەستیان لەســـۆفیگەری: دنیانەویستیو پاڵفتەکردنـــی دەروونە، لەگەڵ ئەوانەی بانگەشـــەی فریادڕەســـتیی شـــێخەکانیانو ئاوێتەبونیان لەگەڵ خوادا دەکەن. بۆ نمونە، ئیبن تەیمیە، هاوکات لەگەڵ تەکفیرکردنی پۆلێک لەرێبەرانی سۆفیگەریدا، کۆڵێک ستایشو تاریفی شێخ عەبدولقادری گەیلانیشی کردوە کە یەک لەهەرە نێودارترین رێبەرانی تەســـەوفە، چونکە دەیویست سۆفیگەری

١. الشيخ اسماعيل بن عبدالغنى الدهلوى: التوحيد افراد الله بالعباده، ل ٤٧ ـ ٤٨

٢. هارون بن بشير أحمد االصديقى: مصادر التلقى عند الصوفيه، ل ٤٨. ابن تيميه : مجموع الفتاوى ج ١٠ ص :٣٩٦

بکێشـــێتەوە بە کەلتـــوری هاوەڵەکانی پێغەمبـــەرداو بەئاقاری شـــەریعەتیدا بباتو لەمیتافیزکو فەلسەفەی دوربخاتەوە.
بەشێوەیەکی گشتی ســـەلەفییەکان، تانەی ئەوە لەسۆفیگەری دەدەن، لەپەرستشو بەناوی رازیکردنی خوداوە، زیادەڕۆیی لەئایندا دەکەن.. بەبێ بەڵگەی قورئانو سوننەت، لەخۆوە پەرســـتش دادەهێنن... زیکرکردنی جۆراوجۆر دادەهێنن. هەروەها رەخنەی ئەوەشـــیان لێدەگرن، «لەسەر هەمان دابو دەستوری گاورەکان گۆڕی رێبەرەکانیان دەکەنـــە مەزارو نەزرگا». هیچ جیاوازییەکیش لەنێوان ئەم هەنگاوەی ســـۆفییەکانو کاری خاچپەرستەکاندا نابینن کە گۆڕی پێغەمبەرو پیاوچاکەکانیان دەکەنە زیارەتگاو پڕیان دەکەن لەوێنەو پەیکەر. هەروەها، لایەنگرانی سۆفیگەریی بەوە تۆمەتباردەکەن کە داهێنەری شیرکنو لەهەمو جێگایەک، مزگەوتیان لەسەر گۆڕی نێودارانی ئیسلام، بنیاتناوە، ئەمەش بۆتە دەســـپێکو ســـەرەتای پەنابـــردنو هاوارکردنە ئەو گۆڕانە.
بەڵام ســـۆفییەکان، شـــانازی بەم کارەیانەوە دەکەنو هیچ خراپەیەکی تێدا نابینن، بەڵکە پێیانوایە خودا، چەند فریشـــتەیەکی تەرخانکردوە بۆ سەر گۆڕی پیاوچاکانو ئەم فریشتانە، پێویســـتی خەڵک دەرئەکەن[1]. هەندێکیتر لەســـۆفییەکان، پێیانوایە «ئەولیـــا»کان لەگـــۆڕی خۆیان دێنـــە دەرەوەو وەک ئەوەی لەژیانی راســـتەقینەی دنیادابـــن مامەڵەو رەفتار دەکەن. هەر لەبەر ئەمەش دەڵێن «مەبەســـت لەزیارەتی گۆڕی پیاوچاکانو پێغەمبەران، داواکردنی لێخۆشـــبونو پڕکردنەوەی پێویستییە»[2].
شـــێخ محەمەد ئەمین نەقشـــبەندیی، فەتوای ئـــەوەدەدات «ماچکردنی کێلی گۆڕی پیاوچاکان، بەمەبەستی تەبەڕوک کردن، ئاساییەو نابێت رێگریی لێ بکرێت». ناوبراو پێی وایە ئەوانەی گۆڕەکان، ماچ دەکەن «بڕوایان وایە خودا کاریگەرو کارسازە، بەڵام لەبەر خۆشەویســـتی خۆشەویســـتانی خودا وەها دەکەن»[3]. جگە لەمەش پێشنیازی ئەوەدەکات بۆ زیارەتکەران، کەچونە ســـەر گۆڕی «ئەولیا» کان، روبکەنە گۆڕەکەو پشـــت بکەنە قیبلەو قورئان بخوێنـــنو خۆیان لەهەموشـــتێکی دنیایی بەدوربگرنو تەنها پەنا بۆ ئەولیاکان ببەن[4]. بەپێچەوانەی ئەمەشـــەوە ســـەلەفییەکان، بونی هیچ

١. تنویر القلوب فی معامله علام الغیوب ٤١٠.

٢. نور الهدایه والعرفان فی سر الرابطه والتوجه وختم الخواجکان لا ٣٨.

٣. تنویر القلوب ٥٣٤

٤. تنویر القلوب فی معامله علام الغیوب ص ٥٣٤.

کاریگەرییەکی مردوی نێو گۆڕەکان لەسەر ژیانی ئێستای مرۆڤ، ناسەلمێنن‌و پەسەند ناکەن. لەدیدو قەناعەتـــی ئەواندا، مردوەکان، هەر پلەو پایەیەکیان هەبێت، لەژیانی بەرزەخدان‌و لەمپـــەرو رێگرێکی گەورە، لەنێوان ئەوان‌و خەڵکی زیندوی ئەم دنیایەدا هەیە، چونکە خودا دەربارەی مردوەکان دەفەرموێت «وَمِنْ وَرَائِهِمْ بَرْزَخٌ إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ».. واتە: تارۆژی دوایی ژیانی ناو گۆڕ لەنێوان مردوەکان‌و زیندوەکاندایە. عوسمانی کوڕی عەفانیـــش ئێژێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وســلم)، فەرمویەتی «گـــۆڕ یەکەم مەنزڵگای ژیانـــی ئاخیرەتە». واتـــە: ژیانی ناو گۆڕ هیچ پەیوەندییەکی بـــەم جیهانەوە نییە. هەروەها لەفەرمودەیەکیتری دروســـتدا، هاتوە پێغەمبەری ئیســـلام(صلى الله عليه وسلم)، ئامۆژگاری ئیبن عەباسی کردوە، «ئەگەر پشتت بەکەس بەست، ئەوە هەر بەخودای ببەســـتە. ئەگەریش داواتکرد، هەر لەخودای بکە. هەمو ئوممەت کۆبنەوە بۆ ئەوەی ســـودت پێ بگەیەنن، ئەوە ناتوانن جگە لەوەی خودا بۆی نوســـیویت ســـودت پێ بگەیەنـــن، هەرەوەها ئەگەر هەمو ئوممەت کۆببنـــەوە بۆ ئەوەی زیانت پێ بگەیەنن، ناتوانن زیانت پێ بگەیەنن، ئەوە نەبێت کە خودا بۆی نوســـیویت، تازە پێنوسەکان بەرزکراونەتەوەو پەڕاوەکان وشـــک بونەتەوە»[1]. هەروەها سەلەفییەکان، پێداگریی دەکەن لەســـەر ئەوەی هیچ جیاوازییەک لەنێوان، پەنابردنی خەڵکی موســـوڵمان بۆ گۆڕەکان‌و پەنابردنی موشـــریکەکان بۆ بتەکان نییە، چونکە وەک لەقورئاندا هاتوە ، بێباوەڕەکانی قورەیشـــیش ئەیانوت ئێمە بتەکان خۆیان ناپەرســـتین بەڵکە تەنها بۆ نزیککردنەوەمـــان لەخودا هاواریان تێدەکەین «وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ أَوْلِيَاءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ» الزمر: ٣. واتە: ئەو کەســـانەی گەورەگەلێکیان بۆ خۆیان دیوەتەوە، ئێژن: ئێمە هەر بۆیە دەیانپەرستین لەخوا نزیکمان بکەنەوە.

سۆفییەکان خۆیان لەسەلەفییەکان بەرەسەنترو دیندارتر دەزانن، بەجۆرێک، دەگێڕنەوە جارێک پرسیارکراوە لەشاهی نەقشبەند: بەهائەدین نەقشبەندی، سۆفی کێیە؟ ئەویش

---

١. ئـــەم فەرمودەیە ئیمامی ترمذی ریوایەتی کردوە فەرمودەناســـەکانیش بەدروســـتیان داناوە. لەم فەرمودەیەدا پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم ) ئامۆژگاری ئیبن عەباس دەکات دەکات «يا غلام، إني أعلمك كلمات، احفظ الله يحفظك، احفظ الله تجده تجاهك، إذا سألت فاسأل الله وإذا استعنت فاســـتعن بالله، واعلم أن الأمة لو اجتمعت على أن ينفعوك بشـــيء، لم ينفعوك إلا بشيء قد كتبه الله لك، ولو اجتمعوا على أن يضروك لم يضروك إلا بشيء قد كتبه الله عليك. رفعت الأقلام وجفت الصحف».

وتویەتی: سۆفی راستەقینە ئەوەیە کە پێویستی بەخودا نەبێت[1]. هەروەها قوشەیریو سەهرەوەردیش پشتگیری ئەم ناساندنەیان کردوە بۆ کەسی سۆفی[2]. سۆفییەکان خۆیان بە«عاشقی خودا» ناودەبەن[3]، جەختیش دەکەنەوە، ناوی نەقشبەند لەوەوە هاتوە کە شێخ بەهائەدینی شای تەریقەتەکە، بەهۆی زۆر یادکردنەوەی خوداوە، وێنەی (الله) لەسەر دڵی نەخشی بەستوە، هەندێکیتریشیان دەڵێن «پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)، لەپی موبارەکی خۆی لەسەر دڵی شێخ محەمەد بەهائەلدینی شاهی نەقشبەند، داناوەو ئەم جێگە لەپەش بۆتە نەخش لەسەر دڵی ناوبراوو تەریقەتەکەش بەناوی نەقش دانراوە[4].

سۆفییەکان، پێیانوایە، هەمو ئەو ئایەتو فەرمودانەی باس لەهاوەڵ بۆخودا پەیداکردن دەکەنو دەربارەی تایبەتکردنی پاڕانەوەو نزاکردنن تەنها بەخودا، مەبەستیان بێباوەڕانە. هەروەها هاوارکردنە پیاوچاکان لەبەر نزیکییانە لەخوداو..... هتد. بەڵام سەلەفییەکان، جەخت دەکەنەوە ئەو ئایەتو فەرمودانە موسوڵمانانیش دەگرنەوەو هیچ جیاوازییەک لەنێوان پەنابردنی موشریکەکانی قورەیش بۆ پەیکەرو بتەکانیانو پەنابردنی موسوڵمانان نییە بۆ گۆڕو نەزرگای پیاو چاکەکان، چونکە بوخاریو موسلیم لەسەحیحەکەیاندا فەرمودەیەکیان لەپێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم)، گێڕاوەتەوە کە فەرمویەتی «بەر لەهاتنی قیامەت، ژنان بەدەوری بتدا دەسوڕێنەوە«. لەفەرمودەیەکیتردا کە موسلیم دەیگێڕێتەوە، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، بەعائیشەی خێزانی فەرموە «بەر لەهاتنی قیامەت، پەرستنی لاتو عوزا (دوو بتی گەورەی قورەیشن) لەنێو ئەهلی ئیسلام سەرهەڵدەداتەوە». هەروەها دەفەرموێت «لا تقوم الساعة حتى تلحق قبائل من أمتي بالمشركين وحتى تعبد قبائل من أمتي الاوثان». صحیح ابن ماجه٣٥٢/٢. واتە: قیامەت نایەت، تا چەند هۆزێکی ئوممەتەکەم نەبنە پاشکۆی موشریکەکانو تا چەند هۆزێکی ئوممەتەکەم نەبنە بت پەرست».

١. الحدائق الورديه في حقائق أجلاء النقشبنديه ص ١٣١.

٢. الرساله القشيريه ١٢٥ عوارف المعارف للسهروردی ١٠٣.

٣. عیزی کوڕی عەبدولسەلام، کە یەکێکە لەرێبەرانی سەلەفییەت، بەکارهێنانی زاراوەو وشەی عیشق بەرانبەر خودای گەورە بەنەشیاو دەزانێتو باس لەوەدەکات، عیشق زیاتر بۆ مارەکردنو حەزی جەستەییەو ئاماژە بۆ فەتوایەکی ئەبی حەسەنی نورییش دەکات، کەنکولی کردوە، عیشق بۆ خودا بەکاربهێنرێتو لەبری ئەمە وشەی خۆشەویستی بەپەسەند دەزانێت.

٤. تنوير القلوب في معامله علام الغيوب ٥٣٩ ط: دار احياء التراث العربي.

# سەلەفییەتو شیعە

لەدەرگادانـــی ئەم ناونیشـــانە، گوزەرکردنی بەنێو مێژوییەکـــی دورودرێژ لەناکۆکیو کێشمەکێشـــدا گەرەکە، چونکە ســـاڵانێکی زۆرە شیعەو ســـەلەفییەکان لەسەر دوو ئاراســـتەی پێچەوانەو دژ بەیەک کاردەکەنو بنەماکانی بیرکردنەوەو تێڕوانینیان زۆر بەکەمی لێکتر نزیک دەبنەوەو بەیەک دەگەن[1].

سەلەفییەکان کە ئوسولیترین گرۆی سوننەکانن، لەهەموکەس زیاتر پلارو تانە لەبیری شـــیعەگەرێتی دەدەن. لەدەیان ناونیشـــانو تەوەرەو موفرەداتی شـــەرعیدا، شیعەو

١ـ جگـــە لەجیـــاوازیو ناکۆکـــی فیکریی، شـــەڕو خوێنرشـــتنی زۆر کەوتۆتە نێوان شـــیعەو سەلەفییەکانەوە. بەناوبانگترین ئەو شەڕانەش پەلاماردانی شاری کەربەلایە لەلایەن وەهابییەکانی نەجدەوە لەســـاڵی ١٨٠٢ زاینی. بەقسەی سەرچاوە مێژوییەکان، بەر لەم هێرشەش ماوەی ١٢ ســـاڵ کەربەلا وێستگەو مەکۆی پەلامارو هێرشـــە یەک لەدوایەکەکانی وەهابییەکانی نەجد بوە. ســـەرەتای هێرشی ساڵی ١٨٠٢ز، بەوە دەستیپێکرد کە شیعەکانی هۆزی خزاعل، هێرشیانکردە ســـەر کاروانێکی نەجدییەکانو ئەو ئاگربەســـتو لێکگەشـــتنەیان پێشـــێلکرد کە لەنێوان میر عەبدولعەزیز محەمەد بن ســـعودو والی عێراقی عوسمانییەکاندا بەرقەراربو. بەدوای ئەمەشدا میر ســـعود بە نزیکەی ٢٠ هەزار چەکدارەوە هاتە ناو عێراقو گەمارۆی شـــاری کەربەلای ئارامگای ئیمام حســـێنی داو دواتریش چوە ناوییەوە. هەندێک ســـەرچاوەی مێژویی دەڵێن لەم شـــەڕەدا پێنـــج هەزار کەربەلایی کوژراون. وەهابییەکان لەنێو کەربەلا هەرچی گومەزیو مزگەوتی ســـەر گۆڕی پیاوچاکەکانی ئالو بەیت بو روخاندیان. هەمان سیناریۆ ساڵی ١٩٢٢ز، دوبارە بویەوەو هێزێکی ســـەلەفی وەهابیی هاتنە ناو شاری سەماوەی عێراقو لەوێشەوە بەرەو کەربەلا رۆشتن، شـــیعەکانیش خۆیان کۆکردەوەو فەتوای بەرەنگاربونـــەوەی وەهابییەکانیان دەرکرد. هەروەها مانگی شوباتی ســـاڵی ٢٠٠٩، کۆمەڵێکی زۆر لەشیعەکانی ســـعودیە بەمەبەستی یادکردنەوەی وەفاتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، لەدەوری گۆڕستانی بەقیع لەمەدینە کۆبونەوە، کارمەندەکانی دەزگای فرمان بەچاکەش «باچاوەشـــی ئاینی»، کەوتنە بڵاوەپێکردنیانو لەئەنجامدا پێکدادانو شەڕە چەقۆو مشتەکۆڵە دروستبو کە ژمارەیەک شیعە کوژرانو برینداربون.

بۆ زیاتر دەربارەی ئەم پێکدادانانەی نێوان شیعەو سەلەفییەکان، بڕوانە: د. أبراهيم خليل أحمد: تأريـــخ الوطن العربي، ل ٢٥٠ ـ ٢٥٥. د. عبدالعكريم رافق: المشـــرق العربي في العهد العيماني، ل ٢٤٨ ـ ٢٥٤. ابـــو مســـعود الندوي: محمد بن عبدالوهـــاب، ل ٨٥. عبدالله محمد: هكذا رأيت الوهابيين ل ٢٧. الســـيد محسن الأمين: كشـــف الارتياب ل٢٠. جعفر السبحاني: مع الوهابيين، ل ١٧

سەلەفییەکان، سەنگەر لەیەک دەگرنو دژ بەیەکتر هەڵوێست وەردەگرن.
بنەماو ریشـــەی شـــیعەگەرێتی لەســـەر بڕوابون بەوەی کە عەلی کوڕی ئەبوتالیبو نەوەکانی شیاوترو لەپێشـــترن بۆ خەلافەتو ئیمامەت بنیاتنراوە[1]. دەستەی یەکەمی شـــیعەکان، کۆمەڵێک کەس بون، پێیانوابو لەدوای کۆچی دوایی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسـلم)، ئالو بەیتو خزمەکانی، لەهەموکەس خـــاوەن مافترن بۆ فرمانڕەوایەتیکردنی موسوڵمانانو گرتنە دەستی پۆســـتی خەلافەت. هەروەها هەمویان کۆکو هاوڕابون لەســـەر لێهاتوییو لەپێشتریی مافی ئیمام عەلی، بۆ جێگرتنەوەی دەسەڵاتی ئاینیو دنیایی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)[2]. بەم پێیەش سەرەتای شیعەگەرێتی لەتێڕوانینێکی سیاســـییەوە سەرچاوەیگرتوە، دواتریش پەلو پۆی فیقهیو عەقیدەییو وردەکاریتری لـــێ کەوتۆتەوە. هەرچەندە زاراوەی «شـــیعە» ناوو ناونیشـــانی هەمو ئەوانەیە کە بەمشـــێوەیە بیردەکەنەوە، بەڵام ئەوانیش لەوردکردنەوەی پێشخستنی ئالو بەیتدا، ناکۆکییان هەیەو بەهەمانشـــێوەی سوننەکان بەســـەر چەندین بۆچونو قوتابخانەی خاوەن فیکری جیاجیاو هەندێکجار دژ بەیەکیشدا دابەشو پەرتەوازەبوون.
بەناوبانگتریـــنو بەربڵاوترین گرۆی شـــیعەکان، دوازدە ئیمامییە جەعفەرییەکانن، کە لەهەمویـــان زیاتـــر داکۆکی لەمافی هـــەر دوازدە ئیمامەکەی ئـــالو بەیت دەکەن بۆ ئیمامەت، کە بریتین لە: عەلی کوڕی ئەبوتالیب، حسێنی کوڕی عەلی، حەسەنی کوڕی عەلی، عەلی کوڕی حســـێن (زين العابدين)، محمەد باقر، جەعفەری ســـادق، موسای کازم، عەلی موســـا رەزا، محەمەد جەواد، عەلی ئەلهادی، حەســـەن ئەلعەســـکەری، مەهدی مونتەزەر (ئیمامی زەمان).
شیعەی دوازدە ئیمامیی جەعفەریی باوەڕو ڕێبازی زۆرترینو بەربڵاوترین خەلکی شیعەیە لەجیهانی ئیســـلامو لەدوای شۆرشـــی ١٩٧٩زایینی گەلانی ئێرانیشەوە، لەدەستوری ئێراندا کراوەتە ئاینزای فەرمی وڵاتو ســـەرچاوەی یاســـادانانی ئێران. لێرەشدا ئێمە ناکۆکیو جیاوازی ئەم ڕێبازەو ســـەلەفییەکان لەسێ تەوەرەی سەرەکیدا وەردەگرین ئەوانیش: ئیمامەت، سەرچاوەکانی شەرعزانیی، هەڵوێست لەسەحابەکانن.

---

١. د. أحمد عرفان عبدالحميد: دراسات فى الفرق والعقائد الاسلاميه، ل١٠

٢. أحمد أمين: فجر الاسلام، الحياه العقليه فى صدر الاسلام ألى آخر الدوله الامويه، ل ٥٨

**ئەلف: ئیمامەت**

نێوەڕۆکی سەراپای بیری شیعەی دوازدە ئیمامی بریتییە لەچەسپاندنی مافی ئیمامەت بۆ ئەو دوازدە کەســـەی بنەماڵەی بەنی هاشـــم، کە ئاماژە بەناوەکانیان کرا. ئەمان، پێیان وایە ئیمامەت پلەو پایەیەکی خودابیە لەچەشنی پێغەمبەرایەتیو بەهەمانشێوەی پێغەمبەرایەتیـــش خودا خەڵکی تایبەتو هەڵبـــژاردە دەکاتە ئیمام. هەروەها دەڵێن «پێغەمبەران، کاری ناساندنی ئیمامەکان ئەنجام دەدەنو ئیمامەکانیش یەک لەدوایەکی ئیمامەکانی دوای خۆیان دەستنیشـــانو دیاریدەکەن»[1]. شیعەکان جەختدەکەنەوە کە خودا بەدەقی قورئان، لـــەدوای هەڵبژاردنی محەمەدی کوڕی عەبدوڵڵا، بە پێغەمبەر عەلـــی کوڕی ئەبوتالیبی، ئامۆژاشـــی کردۆتە ئیمامی موســـوڵمانان، بەڵام هەریەک لەئەبوبەکری ســـدیق، عومەری کوڕی خەتاب، عوسمانی کوڕی عەفان، بەستەمکردنو زۆرداریی خەلافەتو دەسەڵاتیان لێ زەوتکردوەو لەئیمامەت بێبەشیانکردوە[2]. خومەینی پوختەی راوبۆچونو هەڵوێستی مەرجەعەکانی شیعە لەبارەی دوازدە ئیمامەکەی ئالو بەیتەوە، لەوتەیەکدا کۆدەکاتەوەو دەڵێت «ئیمامەکانمان پایەیەکی ئەوتۆیان هەیە کە هیچ پێغەمبەرێکی نێردراوو هیچ فریشتەیەکی نزیک لەخودا پێی ناگات»[3].

پێشخستنی زۆری ئەم ئیمامانەو تۆمەتبارکردنی ئەبوبەکرو عومەرو عوسمان، لەلایەن شیعەوە بەخیانەتو ستەمکردن، سەلەفییەکان تورە دەکاتو لەبیروباوەڕی سەلەفیدا ریزبەندیی خەلیفەکانی ئیســـلام لەمێـــژودا (ئەبوبەکر، عومەر، عوســـمان، عەلی)، بنەمایەکـــی نەگۆڕی عەقیدەیی ئیســـلامییەو هیچ بواری تانەلێـــدانو رەخنەلێگرتنی نییـــە[4]، چونکە وەک ئەلبانی لە (صحیـــح الجامع) دا هێناویەتـــی، پێغەمبەر(صلی الله علیه وسـلم)، پشـــتگیریی ئەم ریزبەندییەی کردوەو لەفەرمودەیەکدا دەفەرموێت «القائم بعدي في الجنة، والذي يقوم بعده فی الجنة، والثالث والرابع فی الجنة». واتە: ئەوەی

---

١ـ عبدالحسين شرف الدين: المراجعات، ابحاث جديده فی اصول المذهب والامامه العامه، ل ١٩٣ ـ ١٩٧.

٢ـ بڕوانە محمد حسين فچل الله: فقه الحياه ل ٤٤٠ ـ٤٥٠. عبدالله محمد الغريب: جاو دور المجوس، ل ١٧٣ ـ ١٨٠

٣ـ الحكومة الاسلامية، ل ٨٢ وەرگیراو لەعبدالله محمد الغريب، جاء دور المجوس

٤ـ بڕوانە ابن تيميه: العقيده الواسطيه، شرح وتعليق محمد بن صالح العثيمين، ل ١٢٧ ـ ١٣٢

لەدوای من ئەبێتە فرمانڕەوا لەبەهەشـــتدایە، ئەوەی دوای ئەویش، هەر لەبەهەشتدایە، ســێیەمو چوارەمیش هەر لەبەهەشـــتدان. هەروەها ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەلو عەمری کوڕی عاســـم، بەچەند سەنەدێک کە ئەلبانی بەدروستی داناوە، فەرمودەیەک لەســـەر زمانی ســـەفینەی ئەبی عەبدولرەحمانی خزمەتکاری پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم )، دەگێڕنەوە کە لەپێغەمبەری بیســـتوە، فەرمویەتی «الخلافة ثلاثون ســـنة ثم يكون بعد ذلك ملكا». واتە: تەمەنی جێنشـــینی پێغەمبەرایەتی ٣٠ساڵ دەبێت. سەفینە فەرمودەکە راڤەدەکاتو دەڵێت «دوو ســـاڵی حوکمڕانی ئەبوبەکر، دە ساڵی عومەر، دوازدە ســـاڵی عوســـمان، شـــەش ســـاڵی عەلی». ئین تەیمیە، لە (مجموع الفتاوى ٣٥/١٨) دا لەبـــارەی ئەم فەرمودەیەوە دەڵێت «بەپێی ئەم فەرمودەیە عەلی کوڕی ئەبوتالیب دوا خەلیفەی ئیســـلامە. تێکڕای ئەهلی سوننە لەزانایانو بەندەکانو میرو جەنگاوەران یەکدەنگن لەســـەر ئەوەی بێژن: ئەبوبەکر، دواتر عومەر، دواتر عوسمان، دواتـــر عەلی». ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەلیـــش لەوەڵامدانەوەی ئەوانەی بڕوایان بەخەلافەتی ئیمامی عەلی نییە، بەو پاساوەی هەمو موسوڵمانان پەسەنیان نەکردوە، ئـــەم فەرمودەیە دەکاتـــە بەڵگەی رەوایەتی خەلافەتی چوارەم خەلیفەی راشـــیدین: عەلـــی کورە ئەبوتالیب. هەروەها وەک ئیبن تەیمیـــە، دەگێڕێتەوە ناوبراو، وتویەتی «هەرکەس عەلی بەچوارەم خەلیفە دانەنێت لەبارەبەری هۆزەکەی سەر لێشێواوترەو بەکۆڕای شـــەعزانەکانی ســـوننە، ئەهلی مەعریفەت، ئەهلی تەسەوف، عامی خەڵک، ژنو ژنخوزایی لەگەڵدا ناکرێت». پێشـــنوێژی حەرەمی مەککە، شێخ عادل کەلەبانی، دەڵێت «ئەگەر شیعەیەکی نەخوێندەوار تانە لەئەبوبەکر بدات، رەنگە پاساوی ئەوەی بۆ بهێنرێتەوە کە نەزانو هەڵخەڵەتێنراوە، بەڵام ئەو شـــیعانەی شارەزای چاکەکانی ئەبوبەکرنو بەردەوامن لەتانەلێدانیو دینی خۆیان لەســـەر قسەپێوتنی بنیات دەنێن، ئەوە فڕیان بەئیسلامەوە نییەو کافرن».

سەلەفییەکان پێیانوایە بەرزکردنەوەی پلەی ئیمامەکانی نەوەی عەلی کوڕی ئەبوتالیب، بۆ ئاســـتێک کە «هیچ پێغەمبەرێکی نێردراوو هیچ فریشـــتەیەکی نزیک لەخودا پێی ناگات»، کوفرێکی ئاشـــکراو روونەو محەمەد عەبدولوەهاب، لە (الرد على الرافضه)و (كشـــف الشـــبهات) دا وەڵامی ئەمە دەداتەوەو دەبێژێت «بەپێـــی کۆڕای زانایانی ئیســـلام، هەرکەس بڕوای وەهابێت، خەڵکانێک هەن کە هاوئاستی پێغەمبەرانن یان پلەیان لەوان بەرزترە، ئەوە کافرەو لەبازنەی ئیسلام دەچێتە دەرەوە».

لەبیری شیعەگەرێتیدا، وتەو رێنمایی دوازدە ئیمامەکە، حوکمی یاساو دەقی قورئانیان

هەیە، هەر دوازدەکەشـــیان لەهەڵـــەو تاوانکردن بـــەدوورن‌و مرۆڤگەلێکی پاکو بێ هەڵەن[١]. هیچ ســـەدەو ســـەردەمێکیش بێ ئیمام‌و پێشـــەوا نییەو لەئێستاشدا ئیمام مەهدی مونتەزەر، کاروباری ئیمامەت بەڕێوەدەباتو ئەویش لەساڵی ٢٦١ کۆچییەوە، لەبەر جەورو ســـتەمی ســـوڵتان‌و خەلیفەکانی ســـوننە، غەیبو پەنهانی بوەو خۆی حەشـــارداوەو رۆژێک دێت دەربکەوێت[٢]. لەماوەی دوورودرێژی خۆ حەشـــاردانی ئیمام مەهدیشـــدا کە لەبەر هەزار ســـاڵەوە دەستپێدەکات، شـــەرعزان‌و پیاوە ئاینییەکان، ئەرکی سەرۆکاریکردنی جەماوەری شیعەکان بەڕێوەدەبەن، چونکە بەپێی بیروباوەڕی شـــیعە ئەرکی شـــەرعزان، جگە لەرێنماییکردن، کۆکردنـــەوەی زەکات، بەڕێوەبردنی ئەوقاف، هەڵسوڕاندنی کاروباری ئابوریو کۆمەڵایەتیش، دەگرێتەوە[٣].

مـــەرجو بەندوباوی شـــیعەکان، بۆ ئیمام تـــەواو جیاوازو پێچەوانەیـــە لەگەڵ مەرجو بەندوباوی سەلەفییەکان، چونکە ئەمان، وەک هەر گرۆیەکیتری سوننی پێیانوایە ئیمام کەسێکی ئاساییو عادەتییەو لەرێگای پرسو راکردنەوە، هەڵدەبژێردرێت، نەک لەسەر راســـپاردەی ئیمامی بەرلەخۆی دابنرێت. بەپێچەوانەی بیری شیعەوە، سەلەفییەکان پێیانوایە، ئیمامەتو خەلافەت، بەشـــێک نییە لەبنەماکانی دین‌و عەقیدەی ئیسلامی، بەڵکە پرسێکی نێوەنجییەو بواری قسەتێداکردن‌و رادەربڕینی هەیەو ئوممەتی ئیسلام، سەرپشـــکو دەســـت کراوەیە لەهەڵبژاردن‌و دەستنیشـــانکردنیدا. هەروەها ئیمامی گەورەی موسوڵمانانیش کەسێکی ئاساییو مرۆڤێکی سادەو بەرجەستەیەو ئەوەندەش بەســـە سەر بەهۆزی گەورەی قورەیش بێتو مەرج نییە، تەنها لەنێو نەوەکانی ئیمام عەلیدا بێت[٤]. بەڵام شـــیعەکان، دەڵێن «ئیمامەت هێندە شـــتێکی ساناو سادە نییە، بدرێتە دەســـت ئوممەتو بەراوێژکردنی خەڵک بسپێردرێت، بەڵکە هەر ئیمامێک لەو دوازدە ئیمامە کەســـێکیان لەدوای خۆیان دەستنیشانکردوە بۆ ئیمامەت». هەروەها دەڵێن «هەرکەسیش رەخنە لەم راستییە بگرێت، ئەوە رەخنەی لەراسپاردەو پەیامی پێغەمبەرایەتـــی گرتوە[٥]». بۆ پڕکردنەوەی بۆشـــایی ئیمامەتیش تا ئەوکاتەی ئیمام

١. محمد صادق الصدر: الشیعه، ل ١١٨

٢. الطباطبائی: رساله التشیع فی االعالم المعاصر، ل ٢٧٢ ـ ٢٧٣

٣. د. آمال االسبکی: تأریخ ایران بین الثورتین، ل ٢٢

٤. د. عبدالسلام بن برجس العبد الکریم : معامله الحکام ل ٣٩

٥. د. أحمد عرفان عبدالحمید: دراسات فی الفرق والعقائد الاسلامیه، ل١٢

مەهدیی دەردەکەوێت، زۆرێک لەشیعەکان پێیان وایە «شەرعزانێکی زۆرزان.. شارەزا لەکاروباری سـەردەم، لەبری مەهدیو بەسـیفەتی ـ جێگری ئیمام ـ کاروباری خەڵک بەڕێـدەکاتو فەتوا دەدات»[1]. ئەم جێگـریو بریکارییەش کە بـە «ولاية الفقيه» دەناسرێت، بیرۆکەیەکی نوێیە لەبیری شیعەگەرێتیداو خومەینی یەکەمین شەرعزانێکی شـیعەیە کە شـەرعیەتی پێداوەو لەئێران بەکردەیی جێبەجێی کردوە، ئێستاش هەر بەپێـی ئەمە عەلی خامنەیی کراوەتـە حوکمڕانی رەهای ئێـرانو «مەقامی بەرزی رێبەریی» شـۆڕشو سیستمی ئیسـلامیی شیعەی ئێرانی پێبەخشـراوە. بەرلەوەی خومەینی ئەم بیرۆکەیە بێنێتە ناو شیعەکانەوە، هەمو شەرعزانو کۆمەڵانی جەماوەری شیعە لەئێرانو سەراپای دنیا، لەچاوەڕوانیی دەرکەوتنی ئیمامدا، بە چاوەسانەوەو ژێر دەستەیی رازیبونو لەنێو حەوزە ئاینییەکانو حوسەینییەکاندا سەری خۆیان کزکردبو، هەمو جۆرە جموجوڵو بزاڤ دروستکردنێکی ئاینیشیان راگرتبوو، بەڵام خومەینی لەم رێگایەوە پەلکێشیکردن بۆ حوکمڕانیو سیاسەت. بەپێی ئەو مەرجانەشی لایەنگرانی ویلایەتی فەقیێ دایاننناوە، «جێگری ئیمام»، کەسێکە کاروباری دەوڵەت، شەریعەت، جیهاد، رادەپەڕێنێتو زەمینە بۆ دەرکەوتنی ئیمام مەهدی خۆشدەکات.

رێبەرانی بیروباوەڕی سەلەفیی، بەتوندی ئەم داهێنانەی خومەینیو لەپشت ئەویشەوە، تێکڕای بیرۆکەی «ئیمامەتی ئالو بەیت»، رەتدەکەنەوەو لەچەندین نوسراوو فەتوادا خومەینی بەوە تۆمەتباردەکەن «دەیەوێت لەپشت پەردەی، جێگری ئیمامەوە بێهەڵەییو پاکوبێگەردیی بەخۆی ببەخشێت، چونکە ناکرێت ئیمام مەعسومو جێگرەکەی کە وەلی فەقێیە، تاوانکاربێت»[2]. هەر بەم هۆیەشـەوە رێبەرە سەلەفییەکان چەندین بەڵگەو راوبۆچونی شـەرعییان گەڵاڵەکردوە کە تێکڕا جەختکردنەوەن لەسـەر تەکفیرکردنی خومەینیو رێبەرە ناودارەکانیتری شیعەگەرێتی[3]. کافربونی شارەزا شیعەکان، یەکێکە لەبنەما نەگۆڕو بەناوبانگەکانی بیری سەلەفی.

---

١ـ السيد محمد حسين الطباطبائي: رساله التشيع فی لعالم المعاصر، ل ٢٣٤

٢ـ بڕوانە عبدالله محمد الغريب، جاء دور المجوس، ل ٣٧٢ ـ ٣٧٥

٣ـ بڕوانە: لماذا أفتى علماو المسلمين بكفر الخميني، «ناوی نوسەرو دەزگای چاپو پەخشی لەسەر نییە».

## با: سەرچاوەکانی شەرع

شـــیعەکان پێیانوایە، ســـەرچاوەی یەکەمی ئیســـلام، کە ئەو قورئانەیە کەئێســـتا لەبەردەســـتدایە، کەموکـــوڕی تێدایـــەو ســـەحابەکان بەپێی بەرژەوەنـــدی خۆیان گۆڕانکارییان تێداکردوە[1]. شـــێخ موفید کە زانایەکی گەورەی شیعەکانە، لەمبارەیەوە دەڵێت «لەچەندین ڕێگاوە، ڕیوایەتی ئالو بەیت کەڵەکەبوەو دەیسەلمێنن ستەمکاران (مەبەست ئەسحابەکانە)، کەموزیادیان لەقورئاندا کردوە»[2].

ئەگەرچی شـــیعەکان، هیـــچ کات، ئەم بۆچونەی خۆیان ئاشـــکراناکەنو هەندێکیش پێیانوایـــە ئەمە تەنها تێڕوانینێکی بەرتەســـکی نێو هەندێک لەشـــیعە پەڕگیرەکانە، بەڵام خومەینی رابەری کۆچکردوی ئێران، ستایشـــێکی زۆری کتێبی «فصل الخطاب فی اثبات تحریف کتاب رب الارباب»و محەمەد حســـەین شـــیرازیی، نوسەرەکەشی کـــردوە، کە باس لەنوقســـانیو کەموکوڕیی قورئـــان دەکات. هەرچەندە، خومەینی خۆی راســـتەوخۆ ناڵێت «قورئان کەموکوڕیی تێدایە».بەڵام بەلای سەلەفییەکانەوە خومەینی لەلایەنگرانی بۆچونی «نوقسانیی قورئانە»، چونکە ستایشی ئەو کەسەی کردوە کە نیشانەی پرسی خستۆتە سەر قورئان.

هەرچی سەرچاوەی دووەمی شەرعزانیشە، کە فەرمودەی پێغەمبەرە، ئەوە سەلەفیو شیعە بەهیچ شـــێوەیەک لەبارەیەوە یەکناگرنەوە، چونکە شـــیعەکان، فەرمودەکانی نێو ســـەحیحەکانی بوخاریو موســـلیم، بەهەنـــد وەرناگرنو بگرە گومانیشـــی تێدا دروســـتدەکەن، کەچی لای ســـەلەفییەکان یەکڕاســـت لەدوای قورئانـــەوە دێن. بەم هۆیەشەوە، ســـەلەفییەکان، جەختدەکەنەوە ســـەرچاوەکانی شەرع لای شیعە جگە لەکوفرو شیرک هیچ شتێکیتر نییە[3].

---

١. طالب بن عثمان محمود: صوره من عقائد الشیعه الاثنی عشریه، ل ٤٩

٢. الشیخ مفید: الافصاح عن الٔامامه، ل ٩٨ وەرگیراو لە دراسات فی الفرق والعقائد الاسلامیه

٣. د. ناصر بن عبدالکریم العقل: رسائل ودراسات فی الافتراق والاهواء والبدع....، ل١٥ ـ٢٠

## ج: هەڵوێست لەسەحابە

سەلەفییەت ڕێزو پێزانینی زۆر بۆ هاوەڵەکانی پێغەمبەر دادەنێت.. لەبنەڕەتیشدا ئامانجی ئەم بانگەوازو ڕێبازە، گشتاندنو بەستاندارکردنی شێوازی بیرکردنەوەو مامەڵەو شێوازی خواپەرستی سەحابەکانە لەنێو ئوممەتی ئیسلام. بەڵام شیعەکان زۆر بێ باکانەو خوێن ساردانە باس لەوەدەکەن، لەدوای کۆچی دوایی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)، چەند دانەیەکی کەمی وەک ئەبوزەڕی غەفاری، سەلمانی فارسی، میقدادی کوڕی ئەسوەدو.....هتد. نەبێت هەموو سەحابەکان لەئیسلام هەڵگەڕاونەتەوەو کافر بوون. دەقو تەورەکانی (أصول الكافي) کەیەک لەپڕ بایەخترین سەرچاوەی شەرعزانیی شیعەکانە، دەربارەی ئەبوبەکرو عومەری کوڕی خەتاب دەڵێت «ئەبوبەکرو عومەر دنیایان بەجێهێشتو نەگەڕانەوە بۆلای خوا.. دانیان نەنا بەوەی ستەمیان لەعەلی کردوە، دە نەفرینی خوداو فریشتەکانو هەمو خەڵکیان لێبێت». هەر لەم سەرچاوە بنەڕەتییەی شیعەشدا بانگەشەی ئەوەکراوە «عومەری کوڕی خەتاب دۆستو هاوەڵی شەیتان بوە»، «عەسمانی کوڕی عەفان، بەنەفرەت لێکراوی دنیای بەجێهێشتوە». بەرانبەر بەمەش سەلەفییەکان کەوتونەتە ناکۆکی لەبارەی ئەوەی ئاخۆ ئەوەی بەمشێوەیە، خراپ لەسەحابەکان بدوێت کافر دەبێت یان نا؟[1] ، بەڵام لەسەر ئەوە پێکهاتون کە سزای شەرعیی ئەو کەسەی بەئاشکرا جنێو بەهاوەڵەکانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)، بەگشتیو ئەبوبەکرو عومەر بەتایبەتی بدات، لەسێدارەدانەو دەڵێن «حوکمی لەناوبردنی شیعەکان لەکوشتنی خەواریجەکان ڕەواترە»[2].

سەلەفییەکان بۆ پشتڕاستکردنەوەی هەڵوێستی ستایشکردنی هەمو سەحابەکانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)، ئاماژە بەچەند فەرمودەیەک دەکەن، کە شێخ محەمەد ناسرەلدین ئەلبانی لە (صحيح الجامع) دا کۆیکردونەتەوەو سەنەدەکانی ساغ کردونەتەوە. ئەو فەرمودانە بەتاکو بەکۆمەڵ، ستایشی سەحابەکان دەکەن. لەم فەرمودە دروستانەدا، پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)، دەفەرموێت «لعن الله من سب اصحابی». واتە: نەفرەتی خودا لەوەی جنێو بەهاوەڵەکانم دەدات. «من سب اصحابی فعليه لعنة الله والملائكة والناس أجمعين» واتە: هەرکەس جنێوی دا بەهاوەڵەکانم، ئەوە نەفرەتی خوداو فریشتەکانو هەمو خەڵکی لێبێت. «لاتمس النار مسلما رآني،

١. عبدالمجيد سالم المشعبى: منهج ابن تيميه فى التكفير، ل ١٢٢ ـ ١٢٥

٢. عبدالله بن سعيد الجنيد: حوار هادیو بين السنه والشيعه، ل ٤٤

أو رأى من رآني» واتە :ئاگر بەر کەسـێک ناکەوێت کە منی دیبێت، یان کەسـێکی دیبێـت کە منی دیـوە. «أن الله تعالى اطلع على أهل بدر فقال: أعملوا ماشـئتم فقد غفرت لكم». واتە: خودا تەماشـای ئەهلی بەدری کـردوەو پێی فەرمون: چی ئەکەن بیکەن، من لێتان خۆشـبووم. «لن يدخل النار رجل شـهد بدرا والحديبية». واتە: هەرکەس لەغەزای بەدرو سـوڵحی حودەیبییە بەشـداریی کردبێت، ناچێتە نێو ئاگر. «لايدخل النار أحد ممن بايع تحت الشجرة». واتە: هەرکەس لەژێر درەختەکەدا بەیعەتـی (ریزوانـی) دابێت ناچێتە دۆزەخ. «آية الايمان حـب الانصار، وآية النفاق بغض الانصار». واتە: خۆشەویسـتی ئەنسارە مەدینەییەکان نیشانەی ئیمانەو رق لێ بونیشیان، نیشانەی دو ڕوییە. «ابوبكر وعمر سيدا كهول أهل الجنة» واتە: ئەبوبەکرو عومەر لەباشترین خەڵکی بەهەشتن. «أنت عتيق الله من النار - قاله لابى بكر» واتە: ئەی ئەبوبەکر تۆ رزگارکراوی خودای لەئاگر. «أن الشيطان ليفرق منك ياعمر» واتە: ئەی عومەری کوڕی خەتاب شـەیتان لێت دەترسێت. «أن الله جعل الحق على لسان عمر وقلبه» واتە: خودا راستیی لەسەر دڵو زمانی عومەر داناوە. «الحياء من الايمان، وأحيى أمتى عثمان» واتە: شـەرمکردن لەئیمانەوەیە، بەشەرمترین کەسی ئوممەتی منیش عوسمانە. «عثمان فى الجنه» واتە: عوسمان بەهەشتییە. «علي مني بمنزله هارون من موسى ألا أنه لانبي بعدى». واتە عەلی بۆمن وەک هارونە بۆ موسا، بەڵام ئەوە هەیە پێغەمبەر لەدوای من نییە[1].

بەلای سەلەفییەکانەوە، تۆمەتبارکردنی دەیانو سەدان لەهاوەڵانی پێغەمبەری ئیسلام (صلى الله عليه وسـلم)، بەکافربونو پاشـگەزبونەوە لەئیسلام، لەسـادەترین واتایدا مانای رەتکردنەوەی ئەو کلتورو شـەریعەتو ئەحکامانەش دەگەیەنێت کە ئەم سـەحابانە گەیاندویانـە بەنەوەکانی دوای خۆیان. جگە لەم لایەنانەش سـەلەفییەکانو شـیعە لەگەورەو بچوکی ئیسـلامدا ناکـۆکو ناتەبان. هەر لەم میانەیەدا، سـەلەفییەکان، هاواربردنی شـیعەکان بۆ ئیمامەکان، سوێند خواردن بەئیمامەکان، بانگکردنیان وەک فریادڕەست، سـوڕانەوەو تەوافکردن بەدەوری گۆڕەکانیان، قوربانیکردن بۆیانو..... هتد. هەموی بەشـیرکو هاوەڵ بـۆ خودا پەیداکردن دەدەنە قەڵـەمو بەڕای ئەوان هەمو پەرستشی شـیعە دژو پێچەوانەی ئەو فەرمودەی خودایە کە دەفەرموێت «قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ. لاَ شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ»

١ـ بڕوانە عصام موسى هارون: السراج المنير فى ترتيب أحاديث صحيح الجامع الصغير، السيوطى، الالبانى ل٦٧٣ ـ ٦٩٠

الانعام ١٦٢ـ١٦٣. واتە: بێژە من نوێژکردنمو ســـەربڕینمو ژینو مەرگم بۆ خودایە، کە ڕاهێنەری دنیا هەر خۆیەتی. خودا هیچ شـــەریکی نییە، فەرمان وا بەمن دراوەو من لەریزی موســـوڵمانان یەکەمینم. هەرەوەها پێچەوانەی ئایەتی « فَـلاَ تَجْعَلُواْ لِلّٰهِ أَندَادًا وَأَنتُـمْ تَعْلَمُـونَ» البقـرة ٢٢. واتە:هاوتـــاو هاووێنە بۆ خودا دامەنێـــن. لەگەڵ دەیان ئایەتیتر کە جەخت لەیەکتاپەرستیو خوداو تەنهاکردنی خودا لەپەرستن.. پاڕانەوە.. قوربانیکردن.. هاوارتێکردن.. هیواپێبوون.. دەکەنەوە.

ئەدەبیاتو گوتاری هەریەک لەشـــیعەگەریو ســـەلەفییەت، پـــڕن لەتۆمەتبارکردنو هێرشـــکردنە ســـەر یەکتر. ســـەلەفییەکان پێدادەگرن لەســـەر ئەوەی «شیعەکان شـــوێنکەوتەو میراتگـــری هەڵگـــەڕاوەو دووڕوەکانن.. درۆزنترین گـــرۆی نێو مێژوی دورودرێژی ئیســـلامن»[1]. ســـەلەفییەکان، لەناساندنو شـــرۆڤەکردنی شیعەدا بیری شـــیعەگەرێتی بە«ئایدۆلۆژیـــای خەڵکی عەجـــەمو هەرچیو پەرچی» دەناســـێننو شوێنکەوتوانیشـــی بە خەڵکانی «کالْفام، حەماســـیی، کەللە ڕەق، خائین، فێڵبازو دەستبڕ، عاتیفی» ناودەبەن[2]. لەبەرانبەریشـــدا شیعەکان، پێیان وایە سەلەفییەکان «دەســـتنێژی ئیســـتیعمار.. تەکفیریی.. دژە ئالو بەیت.. پاشکۆی ئال سعود..... هتد»ن[3].

عەلی خامنەیی، ڕێبەری شۆڕشی شیعەی ئێران کە « جێگری ئیمام»ە لەسەردانێکدا بۆ پارێزگای کوردستانی ئێران، مانگی ئایاری ٢٠٠٩، ڕایگەیاند « سەلەفیو وەهابییەکان دەسکەلای دوژمنانن».

---

١ـ عبدالمجید بن سالم عبدالله المشعبی: منهج ابن تیمیه.....، ل ٤٣٥ ـ ٤٤٠

٢ـ د. ناصر بن عبدالکریم العقل: رسائل ودراسات فی الافتراق والاهواء والبدع....، ل١٥ ـ ٢٠

٣ـ بڕوانە عبدالله محمد: هکذا رایت الوهابیین، ل ٧ لەگەڵ سایتو ماڵپەڕە شیعەکان لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت

# کۆتایی

رانانو گوزەرکردن بەباسو بابەتەکانی ئەم توێژینەوەیەدا ئەم راستیانەی خوارەوە ئاشکراو دیار دەخەن.

ـ سەلەفییەت، بانگەوازێکی ئاینی بەسروشت کۆمەلایەتی لامەزهەبیی ئسولێیە.. داوای گەڕانەوە بۆ سەرچاوە بنەڕەتو رەسەنەکانی ئیسلامو کەلتورو رەفتاری سەحابەکانو تابعینو شوێنکەوتەکانی تابعین، دەکات.. دورکەوتنەوە لەبیدعەو پاکژکردنەوەی بیروباوەڕی ئیسلامی لەشیرکو هاوەڵ بۆخودا پەیداکردن، بە تاقە ئامرازی سەرکەوتنو بەختەوەری جیهانی ئیسلامیو خەڵکانی موسوڵمانو بەئەرکی سەرەکیی پەیامەکەی خۆی دەزانێت. رەگو ریشەی ئەم بیرو بانگەوازەش دەگەڕێتەوە بۆ بەسەرهاتی زیندانیکردنو ئەشکەنجەدانی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لەسەر قبوڵنەکردنی لادان لەمانای زمانەوانیی دەق. لەسەردەمی ئیبن تەیمییەو خوێندکارەکانیشیدا پەرەی زیاتری پێدراوەو رایەڵە فیکریو مەعریفییەکانی گەڵاڵەکراوە، لەسەدەی هەژدەیەمو لەسەر دەستی محەمەد عەبدولوەهابو نەوەکانیو بەهاوکاری میرانی ئال سعود، نۆژەنکراوەتەوەو خزمەتی قایمکردنی پێگەی دەسەڵاتی ئال سعودی فرمانڕەوای سعودیەشی کردوە.

ـ لەئێستادا بانگەوازو رێچکەی سەلەفییەت، زیاتر بەلای هەڵکردن لەگەڵ دەسەلاتدا دەڕوات، تا بەرهەڵستیکردنو یاخیبوون لێیان. هەر لەم سۆنگەیەشەوە تەکفیرکردنی کۆمەڵگاو تەکفیرکردنی رەهای دەسەڵات، رەتدەکاتەوە. هەروەها کاری خۆکوژیو کوشتنی بیانییە مۆڵەتدراوەکانی نێو وڵاتە ئیسلامییەکانو ئەنجامدانی تەقینەوەو کوشتاری بەکۆمەڵ، بەپاساوی کارکردنو جیهادکردن بۆ گێڕانەوەی خەلافەتو دەسەڵاتی ئیسلامی، بەحاڵەتێکی ناشەرعیو تێگەشتنێکی کاڵفامانەی پاشماوەی خەوراجەکان لەقەڵەم دەدات.

ـ سەلەفییەت هەمیشە نەقڵ بەسەر عەقڵدا پێش دەخاتو لەگەڵ سەراپای ئەو رێبازگەو قوتابخانە ئیسلامیانەشدا دژو ناکۆکە کە فەلسەفە، میتافیزیک، عەقڵانییەت، نوێگەریو داهێنانی عیبادەت، دەکەنە سەرچاوەی بیرکردنەوەو تێڕوانینی خۆیان. هەروەها مەشخەڵهەڵگرانی سەلەفییەت زۆر بەبڕوابوخۆبونەوە گوتارو بۆچونی خۆیان دەخەنەڕو، هەمیشە قەتعیو بنجبڕن لەحوکمدانو فەتوادان.

# سەرچاوەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە


١ـ قورئانی پیرۆز ـ لەگەڵ وەرگێڕانی مامۆستا هەژار، نشر أحسان، ١٩٩٩ زاینی.
٢ـ عصام موسى هارون: السراج المنير فى ترتيب أحاديث صحيح الجامع الصغير، الحافظ جلال الدين الســـيوطى، العلامه محمد ناصرالدين الالبانى، ط٣، ٢٠٠٩، دار الصديق، مؤسسه الريان للنشر، السعوديه ـ الجبيل
٣ـ ابو مسعود الندوى، محمد بن عبدالوهاب مصلح مظلوم ومفترى عليه، ط١، المدينه المنوره، جامعه محمد بن سعود الاسلاميه، ١٩٨٤
٤ـ شـــيخ الاســـلام ابن تيميه، مجموع الفتاوى، جمع وترتيب عبدالرحمن النجدى وآخرون، ط١، القاهره: مكتبه ابن تيميه، ١٣٩٨ هجرى.
٥ـ محمد ناصرالدين الالبانى، السلفيه، حقيقتها ـ اصولها ـ موقفها من المذاهب ـ شبهه حولها، جمعها وشرحها: عمر عبدالمنعم سليم، ط١، ٢٠٠٧، دار الضياء ـ القاهره
٦ـ عبدالله عبدالحميد الاثرى، الوجيز فى عقيده السلف الصاالح، ط١، ١٩٩٧م، تركيا، مكتبه الغرباء.
٧ـ د. ابراهيـــم خليـــل أحمد، تأريخ الوطن العربى فى العهـــد العثمانى، بدون طبعه، الموصل: مديريه مطبعه جامعه الموصل، بدون سنه.
٨ـ الحافظ أحمد الحكمى، اعلام سنه المنشوره، ط٢، السعوديه: الرئاسه العامه للبحوث العلميه والدعوه، ١٩٧٩.
٩ـ أســـماعيل بن عبدالغنى الدهلـــوى، التوحيد افراد الله بالعباده، ط١، الســـعوديه، مكتبه العبيكان، ١٩٩٢.
١٠ـ ابراهيم العســـعس، السلف والسلفيون (رؤيه من الداخل)، بدون رقم الطبعه، عمان ـ الاردن: بدون أسم الناشر، ١٩٩٩ م.
١١ـ أحمد بن حجر آل بوطامى، الشيخ محمد بن عبدالوهاب عقيدته الاصلاحيه ودعوته السلفيه، بدون رقم الطبعه، مكه ـ السعوديه: مطبعه الحكومه، ١٣٩٥ هجرى.
١٢ـ د. آمال الســـبكى، تأريخ ايران بين الثورتين ١٩٠٦ ـ ١٩٧٩، ط١، الكويت، عالم المعرفه (المجلس الوطنى للثقافه والفنون والاداب)، ١٩٩١ م.
١٣ـ أحسان ألهى ظهير، التصوف المنشأ والمصادر، ط١، لاهور ـ باكستان: أداره ترجمان السنه، ١٩٨٦.
١٤ـ أحمد أمين، فجر الاســـلام الحياه العقليه فى صدر الاســـلام ألى آخر الدوله الامويه، ط١، بيروت: دار االكتاب العربى، ١٩٦٩
١٥ـ د. ابراهيم بن عامر الرحيلى، موقف أهل السنه والجماعه من اهل الاهواء والبدع، ط١، الرياض: دار السلفيه، ١٤١٢ هجرى.
١٦ـ د. أحمد بن عرفان عبدالحميد، دراســـات فى الفرق والعقائد الاسلاميه، ط١، بغداد: دار التربيه، ١٩٧٧.
١٧ـ أحمد صديق عبدالرحمن، البيعه فى النظام السياســـى الاســـلامى، ط١، القاهره: مكتبه الوهبه، ١٩٨٨.
١٨ـ أحمد بن زينى دحلان، فتنه الوهابيه، بدون رقم الطبعه، اســـتانبول، تركيا ـ مكتبه النور،

.١٩٨٧
١٩ـ ابن حجر العسقلاني، فتح الباري، شرح صحيح البخاري، بدون رقم الطبعه، القاهره: دار الريان للتراث، ١٩٨٧.
٢٠ تقى الدين النبهانى، نظام الحكم فى الاسلام، ط١، سلسله الرايه (٦).
٢١ـ تحسين ابراهيم الدوسكى، مذكرات الجاسوس الانگليزى همفر فى الميزان، ط١، دهوك ـ أقليم كردستان العراق: مطبعه هاوار، ٢٠٠١.
٢٢ـ جعفر السبحانى، مع الوهابيين فى خططهم وعقائدهم، ط١، طهران، مؤسسه الفكر الاسلامى، ١٤٠٦ هجرى.
٢٣ـ جلال الدين بن عبدالرحمن السيوطى، تأريخ الخلفاء، تحقيق قاسم الشماعى وآخرون، ط١، بيروت: دار القلم، ١٩٨٦.
٢٤ـ د. حسن الترابى، المصطلحات السياسيه فى الاسلام، ط١، بيروت: دار الساقى، ٢٠٠٠.
٢٥ـ خالد بن على بن محمد العنبرى، الحكم بغير ما أنزل الله واصول التكفير، ط٢، جده ـ السعوديه: مكتبه العلم، ١٩٩٦
٢٦ ـ د. ربيع بن هادى المدخلى منهج أهل السنه والجماعه فى نقد الرجال والكتب والطوائف، ط٢، المدينه المنوره: دار الرجب للنشر والتوزيع، ١٩٩٤.
٢٧ ـ روبرت كارمن درايفوس، رهينه خمينى مطابخ المخابرات الانكلو أمريكيه، ترجمه وتقديم، د, شمس الدين ناصر، بدون رقم طبعه، ابوظبى، بدون ناشر وسنه النشر.
٢٨ ـ زين الدين عمر بن مظفر، تأريخ ابن الوردى، ط١، بيروت، دار الكتب العلميه، ١٩٩٦.
٢٩ـ سنت جون فيلبى، تأريخ نجد ودعوه الشيخ محمد عبدالوهاب (السلفيه) تعريب عمر الديراوى، بدون رقم الطبعه، بيروت، المكتبه الاهليه للنشر، بدون سنه الطبع.
٣٠ـ سيد قطب، معالم فى الطريق، ط١٠، قم: دار الكتاب الاسلامى، ١٤٠٣ هجرى.
٣١ د. سفر بن عبدالرحمن الحوالى، منهج الاشاعره فى العقيده، ط١، السعوديه: دار الوطن، ١٩٨٦.
٣٢ـ د. سفر بن عبدالرحمن الحوالى، شرح رساله تحكيم القوانين، ط١، القاهره: مكتبه الطيب، ١٩٩٨.
٣٣ـ سليم الهلالى، البدعه واثرها السيء فى الامه، ط١، القاهره، مكتبه اطيب، ١٩٩٨
٣٤ـ ستيفن همسلى لونكريك، اربعه قرون من تأريخ العراق الحديث، ط٣، بغداد: مطبعه جعفر الخياط، ١٩٩٢.
٣٥ـ سليمان بن عبدالوهاب، الصواعق الالهيه فى الرد على الوهابيه، أعده لجنه من المحققين، ط١، قم ـ ايران: مجمع أهل البيت، ١٤٢٠ هجرى.
٣٦ـ سليمان بن سحمان النجدى، مجموعه الهديه السنيه والتحف النجديه، مكه: مطبعه الحكومه، ١٣٨٠ هجرى.
٣٧ ـ صابر طعيمه، الصوفيه معتقدا ومسلكا، ط١، الرياض ـ السعوديه: شركه العبيكان للطباعه والنشر، ١٩٨٥
٣٨ـ د. صالح بن فوزان بن عبدالله الفوزان، كتاب التوحيد، ط٣، السعوديه: وزاره الشؤون الاسلاميه والاوقاف والدعوه والارشاد.
٣٩ـ صلاح الدين المختار، تأريخ المملكه العربيه السعوديه، بدون رقم طبعه، بيروت ـ لبنان:

مكتبه الحياه، بدون سنه الطبع.
٤٠. طالب بن محمود عثمان محمود العراده، صور من عقائد الشـــيعه، ط٢، استانبول ـ تركيا: مكتبه الغرباو، دار الاثريه للطباعه والنشر، ١٩٩٣.
٤١. د. عبدالمنعـــم الحنفى، موســـوعه الفـــرق والجماعات والمذاهـــب والاحزاب والحركات الاسلاميه، ط٢، مكتبه المدبولى للطباعه والنشر، ١٩٩٩.
٤٢. عبدالوهـــاب االكيالى، الموســـوعه السياســـيه، ط١، بيروت ـ لبنان، بدون مكان النشـــر، ١٩٩٤
٤٣. عبدالحليم الرهيمى، تأريخ الحركه الاسلاميه فى العراق، الجذور الفكريه والواقع التأريخى، ط١، بيروت: دار العالميه، ١٩٨٥.
٤٤. عثمان بن بشر النجدى: عنوان مجد فى تأريخ نجد، بدون رقم الطبعه، السعوديه: المكتبه السلفيه، ١٣٤٩ هجرى.
٤٥. د. عبدالكريم رافق: المشرق العربى فى العهد العثمانى، بدون رقم الطبعه، دمشق سوريا: مطبعه ابن حيان، ١٩٩٩م.
٤٦. د. عبدالله عبدالمحســـن التركى: مقدمه شرح العقيده الطحاويه (ابى العز الحنفى)، بدون طبعه، السعوديه: مؤسسه الرساله، ١٤٢٠ هجرى.
٤٧. د. علـــى الـــوردى، لمحات من تأريخ العـــراق الحديث، ط١، بغـــداد، مطبعه المعارف، ١٩٧٩.
٤٨. عبدالله محمد: هكذا رأيت الوهابيين، ط٢، طهران: مكتبه السعاده، ١٤٠٢.
٤٩. عبدالعزيز زيد الرومى وآخرون: مؤلفات الشيخ الامام محمد بن عبدالوهاب، ط١، السعوديه: دار ابن الجوزى، ١٤٢٠ هجرى.
٥٠ ـ عبدالعزيـــز عبداللـــه بن باز: المعلـــوم من واجب العلاقه بين الحاكـــم والمحكوم، ط١، السعوديه: دار السلفيه، ١٤٢٢ هجرى.
٥١ ـ الشيخ عبدالرحمن بن حسن آل الشيخ: فتح المجيد شرح كتاب التوحيد، ط١، بغداد: مطبعه جمال العبدلى، ١٩٨٩.
٥٢. عبدالعزيز عبدالغنى صقر: نظريه الجهاد فى الاســـلام، بدون رقم الطبعه، القاهره، بدون ناشر، ١٩٨٣.
٥٣. د. عبدالســـلام بن برجـــس العبدالكريم: معامله الحكام فى ضوء الكتاب والســـنه، ط٦، السعوديه: مكتبه الفرقان.
٥٤. على بن حســـن بن على الحلبى الاثرى: علم أصول البدع، ط١، الرياض ـ ســـعوديه: دار الرايه للنشر والتوزيع، ١٩٩٢.
٥٥. ابو الحســـن على الحســـنى الندوى : رجال الفكر والدعوه فى الاســـلام، ط١، دمشـــق ـ سوريا:دار ابن كثير، ١٩٩٩.
٥٦. د. عبدالمجيد بن سالم عبدالله المشعبى: منهج ابن تيميه فى مسأله التكفير، ط١، الدوحه ـ قطر: مكتبه ابن القيم، ١٩٩٧.
٥٧. عثمان بن معلم محمود: موقف المسلم من القتال فى الفتن
٥٨ ـ عبدالمنعم مصطفى حليمه: الطريق ألى استئناف حياه اسلاميه، ط١، عمان، بدون ناشر، ٢٠٠١
٥٩. عبدالله بن سحمان الاحمدى: المسائل والرسائل المرويه عن الامام أحمد فى العقيده، بدون

رقم الطبعه، السعوديه: دار الطيبه، ١٤١٢ هجرى.
٦٠ـ عثمان بن محمد آل خميس: حقبه من التأريخ، ط١، السعوديه، دار ابن الجوزى، ١٤٢٠.
٦١ـ عامر عبدالله فالح: معجم ألفاظ العقيده، ط١، السعوديه: مكتب العبيكان، ١٩٩٧.
٦٢ـ عبدالاخر حماد الغنيمى: المنحه الالهيه، تهذيب شرح االطحاويه، ط١، السعوديه: دار الرايه للنشر والتوزيع، ١٩٩٨م.
٦٣ـ عبدالعزيــز بن محمد عبداللطيف: دعاوى المناوئين لدعوه الشــيخ محمد بن عبدالوهاب، بدون رقم الطبعه، الرياض ـ السعوديه: دار الوطن للنشر، ١٤١٤ هجرى.
٦٤ ـ عبدالرحمن الوكيل: هذه هى الصوفيه، ط٤، بيروت ـ لبنان: دار الكتب العلميه، ١٩٨٤.
٦٥ـ عبدالله محمد الغريب: جاء دور المجوس، الابعاد التاريخيه والعقائديه والسياســيه للثوره الايرانيه، ط٦، الدمام ـ السعوديه.
٦٦ـ عبدالله بن ســعيد الجنيد: حوار هادىء بين الســنه والشــيعه، ط١، بدون ســنه ومكان النشر.
٦٧ـ عبدالحســين شــرف الدين: المراجعات، ابحاث جديده فى اصول المذهب والامامه العامه، طهران ـ ايران: نشر التوحيد ١٩٨٩.
٦٨ـ كارل بروكلمان: تاريخ الشــعوب الاســلاميه، تعريب منير البعلبكى وآخرون، ط١٤ بيروت ـ لبنان: دار العلم للملايين ٢٠٠٠ م.
٦٩ـ محمد بن عبدالوهاب، كتاب التوحيد، ط١، بغداد: مطبعه جمال العبدلى، ١٩٨٩
٧٠ـ محمد بن عبدالوهاب ، مسائل الجاهليه، بغداد: مطبعه الجمال العبدلى، ١٩٨٩.
٧١ـ محمــد بن عبدالوهاب، مختصر زاد المعــاد، لابن قيم الجوزيه، ط١، بغداد، بدون مطبعه، ١٩٨٩.
٧٢ـ د. محمد حرب: العيمانيون فى التأريخ والحضاره، العثمانيون فى التاريخ والحضاره، ط٢، دمشق: دار القلم، ١٩٩٩ م.
٧٣ـ محمد حســين فضل الله: فقه الحياه، حوار اجراه عادل القاضى وآخرون، طهران، مؤسســه التوحيد، ١٩٩٩ م.
٧٤ـ د. محمــد بن عبدالرحمن الخميس: أعتقاد الائمه الاربعه، ابى حنيفه ومالك والشــافعى وأحمد، ط١، الرياض ـ سعوديه: دار العاصمه، ١٩٩٢.
٧٥ـ محمد قطب، كيف نكتب التاريخ الاسلامى، ط١، دار الكتاب الاسلامى، ١٩٩٤.
٧٦ـ محمد بن جميل زينو: العقيده الاســلاميه فى ضوء الكتاب والســنه، ط٥، الرياض، دار السلفيه، ١٣٨٥ هجرى.
٧٧ ـ محمــد بن جميل زينو: التحذير من فتن لكفر والتكفير، ط١، الرياض: مكتب الســلفيه، ١٩٩٧ م.
٧٨ـ محمد بن جميل زينو: منهاج الفرقه الناجيهوالطائفه المنصوره، ط١٩، جده ـ السعوديه، دار المجمع العلمى، ٢٠٠٠
٧٩ـ محمد عتريس: معجم بلدان العالم، ط١، القاهره، دار اثقافه للنشــر والتوزيع، بدون ســنه الطبع.
٨٠ـ د. مصطفى البغا، حاضر العالم الاســلامى، بدون رقم الطبعه، منشــورات جامعه دمشق، ١٩٩٨ ميلادى.
٨١ـ محمد جميل بهيم، فلسفه التأريخ العثمانى، ط١، بيروت: مكتبه الصادر، ١٩٢٥.

٨٢. المنجد فى اللغه والاعلام، ط٣٧، بيروت: دار المشرق، ١٩٩٨.

٨٣. د. د.محمد خاتمى: الفكر والدين فى فخ الاستبداد، تعريب وأختصار وتعليق د. ثريا محمد على، مكتبه الشروق، ١٩٩٥.

٨٤ ـ د. محمـــد بن ربيع هادى المدخلي: حقيقه الصوفيه فى ضوء الكتاب والســـنه، ط٥، القاهره ـ مصر: مكتبه ابن تيميه، ١٤٠٤ هجرى.

٨٥. محمد عبدالهادى المصرى: أهل السنه والجماعه، معالم الانطلاق الكبرى، ط٥، استانبول ـ تركيا: دار الاثريه للصباعه والنشر، ١٩٩٢.

٨٦. الســـيد محمد حســـين الطباطبائى: رساله التشـــيع فى لعالم المعاصر، مؤسسه أم القرى للتحقيق والنشر، ١٤١٨ هجرى.

٨٧. محمد صادق الصدر: الشـــيعه، بدون رقم الطبعه، بغداد: مكتبه النينوى الحديثه، ١٣٥٢ هجرى.

٨٨. محمد خليل هراس: شـــرح العقيده الواســـطيه، راجعه الشـــيخ عبدالـــرزاق العفيفى، ط٤، السعوديه: أداره االبحوث العلميه والافتاء والارشاد، بدون سنه الطبع.

٨٩. محمد بن صالح العثيمين، القواعد المثلى فى صفات الله واسمائه الحسنى، ط٣، سعوديه: مركز الدعوه بجامعه الاسلاميه، ١٤٩.

٩٠. محمد بن صالح العثيمين، شرح العقيده الواسطيه، لشيخ الاسلام ابن تيميه، ط١، السعوديه: دار ابن الجوزى.

٩١. محمد بن صاالح العثيمين، التعليقات على كشف الشبهات، ط١، منشورات جمعيه السلام الخيريه ـ مكه. ١٤٢٠.

٩٢. محمد ناصرالدين الالبانى: سلسله الاحاديث الصحيحه، ط٥، عمان ـ المكتب الاسلامى.

٩٣. محمد كمال جمعه: دعوه الشيخ محمد بن عبدالوهاب خارج الجزيره العربيه، ط١، السعوديه: دار الوطن، بدون سنه الطبع.

٩٤. مرتضى المطهرى، الروايه الكونيه التوحيديه، ط١، القاهره: مؤسسه الرساله، ١٩٨٧.

٩٥. محمد بن على الشـــوكانى: نيل الاوطار، تحقيق على محمد معوض وعادل عبدالموجود، دار الكتاب العربى ـ بيروت، ط١، ٢٠٠٠.

٩٦. اشرف بن عبدالحميد، بن بارقعات، مظاهر التشبه بالكفر فى العصر الحديث واثرها على المسلمين، ط١، السعوديه: دار ابن الجوزى.

٩٧. مجله الاصاله ـ http://www.asaala.com

٩٨ ـ د. محين عبدالحميد، نوێكردنەوەی بیری ئیســـلامی، وەرگێڕانی ئیبراهیم میكە عەلی، بەرگی یەكەم، ١٩٩٩، بلاوكراوەكانی كتێبخانەی رەسەن

٩٩. موقع «بوابه المملكه». com.٣_www.ksa

١٠٠. موقع الشيخ سفر الحوالى www.alhawali.com